چاپی دووەم

# رەتدانەوەی گومانەکان لە بارەی هاوسەرگیری پێغەمبەری خودا ﷺ

نوسینی دکتۆر لوقمان جامیعی

وەرگێرانی: یاد نورسی





# ڕەتدانەوەی گومانەکان

# لەبارەی هاوسەرگیری

# پێغەمبەری خودا( ﷺ )

نوسینی :

دکتۆر لوقمان جامیعی

وەرگێرانی :

یاد لقمان محمد علی( یاد نورسی )

**ناسنامەی کتێب**

ناونیشانی کتێب : ڕەتدانەوەی گومانەکان لەبارەی هاوسەرگیری پێغەمبەری خودا(ﷺ)

نوسەر : دکتۆر لوقمان جامیعی

وەرگێر : یاد لقمان محمد علی(یاد نورسی)

نەخشەسازی بەرگ : موستەفا ئیحسان

تایپ : موحەمەد دیار

هەڵەچن : بوشرا عبدالله خۆرانی

ساڵی چاپ : ٢٠١٦ زاینی – ١٤٣٧کۆچی

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

چاپ : دووەم

چاپخانە : ڕۆژهەڵات - هەولێر

ژمارەی سپاردنی (٩٣) ساڵی ٢٠١٦ ی لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان دراوەتێ

خودای بالادەست دەفەرموویت.:-

(وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا)[1]

عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا ذَكَرَ خَدِيجَةَ أَثْنَى عَلَيْهَا، فَأَحْسَنَ الثَّنَاءَ، قَالَتْ: فَغِرْتُ يَوْمًا، فَقُلْتُ: مَا أَكْثَرَ مَا تَذْكُرُهَا حَمْرَاءَ الشِّدْقِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهَا خَيْرًا مِنْهَا، قَالَ: «مَا أَبْدَلَنِي اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرًا مِنْهَا، قَدْ آمَنَتْ بِي إِذْ كَفَرَ بِي النَّاسُ، وَصَدَّقَتْنِي إِذْ كَذَّبَنِي النَّاسُ، وَوَاسَتْنِي بِمَالِهَا إِذْ حَرَمَنِي النَّاسُ، وَرَزَقَنِي اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَلَدَهَا إِذْ حَرَمَنِي أَوْلَادَ النِّسَاءِ»[2]

---

[1] الاحزاب ٥٣

[2] حديث صحيح، وقيل: حسن. رواه احمد والطبراني، واللفظ لأحمد.

ينظر: مسند الامام احمد، حديث (٢٤٨٦٤): ٣٥٦/٤١، معجم الطبراني، حديث (٢٢): ١٣/٢٣

بسمه تعالى

بەناوی خودای خودانی لوتف و میهرەبانی

سەڵات و سەلام بڕژێ بەسەر پەیامبەری خودا(ﷺ) و ئال و بەیت و یارانی و جێنشینانی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و هەموو هاوەڵانی بە ئەجمەع ڕەزا و ڕەحمەتی پەروەردگاری مەزنیان لێبێت..

لەم سەردەمەدا، لەهەر چوار لای دونیاوە، دوژمنانی دین خەریکی دوژمنایەتی سەرسەخت و توندی ئەهلی ئیسلامن، جا لەو پێناوەشدا هەموو وەسیلە و ڕێگایەك دەگرنە بەر، بە حوکمی ئەوەی ئێستا لەم سەردەمەدا شەڕ شەڕی فیکر و قەڵەمە، دوژمنان زیاتر و زۆرتر بەو ڕێگایەوە هێرش دەهێنن، موسڵمانانیش دەبێت بە هەمان وەسیلە و شێواز وەڵامیان بدەنەوە، یەکێ لەو بابەتانەی زێد لە پێویست ورژێنراوە و بەهەڵە لەخەڵکی گەیاندراوە، باسی هاوسەرگیری پەیامبەری سەردار و سەروەرمانە(ﷺ)لەگەڵیشیدا باسی تەمەنی حەزرەتی خاتوو عائشە(ﷺ)، گومانگەلێکی بێ مانا و دوور لە ڕاستی بۆ خەڵکی دروست کراوە، داخبارم ..خەڵکێك لە نێو موسڵمانانیش باوەری بەو گومانانە کردووە و لەنێو دڵیاندا چەسپاندوویانە..

خوێنەری زێدە ڕێزدار..:-ئەم کتێوەی ژێر دەستت وەڵامێکی پوخت و کامڵە بۆ ئەو باسانە و پوچەڵکردنەوەی ئەو گومانانە، لەم کاتەشدا چاپکردنەوەی دووەمیمان بە پێویستییێکی شیاو و گەورە زانی..

سوپاس بۆتۆ پەوەردگارا، کە هەمیشە هۆکارگەلێك و دەرگای چاکەی فـرە مــەزن و گەورەت بۆ ئێمەی موسڵمانان داناوە، بۆ خزمەتکردنی ئاینەکەی خۆت و وەدەستهێنانی پاداشت و ئەجری بێ پایان..

پەروەرێنی دلۆڤان بە لوتف و کەرەمی خۆی ئەم کارەمان لێ وەقەبوڵ بفەرمووێت، لە ئێوەی خوێنەری ئازیزیشەوە داواکاری دوعاین، خـودای تـەعالا تـەوفیق و سـەرکەوتنی زیاترمان پێ عەتا بفەرمووێت..

یاد لوقمان محمد علی

(یاد نورسی)

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشەکی نوسەر:

**الحمد لله رب العالمين، و الصلاة و السلام على المبعوث رحمة للعالمين محمد صلى الله عليه وسلم و على آله و أصحابه اجمعين، ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين.**

ناکۆکی نێوان حەق و باتیڵی کۆن، هەر لەو ڕۆژەوە دەستپێدەکات کە خودای حەق تەعالا ئیبلیسی لەژێر سایەی ڕەحمەتی خۆیەوە وەدەرنا، چون سەرپێچی فەرمانی خودای کرد و سوجدەی ڕێز و شکۆی بۆ حەزرەتی ئادەم(سەلامی خودای لێبێت)نەبرد، ئیدی ئیبلیسیش بریاری دا کە تا ڕۆژی"قیامەت"نەوە و وەچەی ئادەم لەخشتەبەرێت و دوژمنایەتیان بکات بە هۆکارگەلێکی بێ ئەندازە و بێ شومار.خودای باری تەعەلا فەرمووی: **(قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ, وَإِنَّ عَلَيْكَ اللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ الدِّينِ , قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ , قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ , إِلَىٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ ، قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ، إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ)**[٣]

واتە: خوا فەرمووی: (چونکە لە فەرمانی من سەرپێچیت کرد، دەبێت لەم شوێنە نەمێنیت، کە بەهەشتە یان ئاسمان) کەواتە دەرچۆ لێرە چونکە بەڕاستی تۆ نەفرین لێکراویت.بەڕاستی نەفرینی خوات بەردەوام لەسەرە هەتا ڕۆژی دوایی. شەیتان وتی: پەروەردگارا، مۆڵەتم بدە هەتا ئەو ڕۆژەی هەمووان زیندوو دەکرێنەوە. خوایش فەرمووی: دەتۆ لە مۆڵەتدراوانیت.تا ڕۆژی کاتە دیاریکراوو زانراوەکە (لای خوا). ئیبلیس (بە بوغرو کینەو حەسادەتەوە) وتی: پەروەردگارم، مادەم بەهۆی ئەم ئینسانەوە منت سەر لێشێواو کرد، شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناهو لادان و تاوانێکیان لا جوان و شیرین بکەم و هەر هەموویان سەر لێشێواوو سەرگەردان بکەم. بێجگە لە بەندە پوختە و

[٣] الحجر ٣٤-٤٠

دڵسۆزەکانی خۆت نەبێت (چونکە دڵیان بە باوەڕ بە تـۆو یـادی تـۆ ئاوەدانـە، هـەوڵ و کۆششی من بۆ وێڵ کردنیان ناکامە)[٤].

یەکێك لەو هۆکارانەی کـە ئیبلـیس و یـاوەرانی لـە مرۆڤـان بـەکاری دەهێـنن بـۆ دوژمنایەتی و جـەنگان دەگـەڵ ئـەهلی ئیسلام.،چـاندنی شـك و گومانـە لـەنێو دڵـی موسڵماناندا، ئیدی هەموو یاوەرانیشی وەك هـاوڕێ و هاورێبـاز و هاوکـارێکی دڵسـۆز یاریدەدەری ئیبلیس دەکەن بـۆ بڵاوکردنـەوەی شـەر و خراپـەکاری و پـەیامی ناراسـتی ئیبلیس، پەروەردگار دەفەرمووێـت: (وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ)[٥]

واتە: هەر بەو شێوەیە (کێشمە کێشی ئیمانداران و خوانەناسان بەردەوامـە) جـا بـۆ هەموو پێغەمبەرێك (بۆ ئیماندارانیش) دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری سازاندوە، کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بەگوێی یەکداو (خۆیان و خـەڵکی) پـێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن، خۆ ئەگەر پـەروەردگارت بیویسـتایە (نەیانـدەتوانی) شـتی وابکەن، دە وازیان لێ بهێنە لەگەڵ ئەو درۆو دەلەسەیەی کە هـەڵی دەبەسـتن (بـۆ کـوێ دەچن، لە دەست سزای خوایی ڕزگار نابن).

لە پێویستیەکانی ئیمان بە خودای باڵادەست باوەرهێنانە بەوەی کەوا هیچ شتێك بریار نادات بۆ بەندەکانی، مەگەر سوود و چاکەی ئەوانی تێـدا بێـت، وە ئـەوەش راسـتێکی هێندە روونە، کە هیچ هەڵەیێك لە خۆناگرێت.

خودای گەورە کەسانێك هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندن و جێبەجێکردنی پەیامەکەی، کە ئەو کەسە پۆلێنکراو و هەڵبژاردراوی باشترینی نێوان هەموو دەوروبەرەکەیەتی، ئیـدی بۆیـە

---

[٤] تێبینی: لە تەفسیر کردنی هەموو ئایەتەکان پشتمان بەستاوە بە تەفسیری ئاسانی مامۆستا بورهان محمد ئەمین..
[٥] الأنعام ١١٢

پەیامبەران(سەلامی خودایان لێبێت)لەچاکترینی مرۆڤەکانن، و مەعصومن و بێ بەرین لە هەموو تاوان و گوناهێك..

ئینجا پەروەردگار موحەمەد(ﷺ)ی هەڵبژارد لەنێوان هەموو پەیامبەرانی دیکەیدا، و کردی بە خاتەمی کۆتایان بۆ گەیاندنی پەیام بۆ مرۆڤەکان، بۆیە پەیامبەر سەید و ڕەهبەری خەڵك و خۆشەویستی حەقە..

وەلێ ئەفسوس، لەگەڵ ئەو شتانەی کە باسیشمان کرد، خەڵکانێك هەن کە دەروون نەخۆشن و کەسانێکیش کە سەرسام و سەرمەستن پێیانەوە، پەیامبەرانی خودای تەعالا تاوانبار دەکەن بە خراپەکارێك کە جگە لە کەسانی خراپ نایکەن وەکو سیحر و کاهینایەتی و درۆ..هتد..

ئیدی ڕەسولی سەرداریان(ﷺ) بە شێت ناوزەند کرد، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو سەرکردەی عاقڵان و ژیرانە (وَقَالُوا يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ)[٦]و بە شاعیر ناوزەندیان کرد و گوتیان قورئان شیعر و خەونە(بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ)[٧]و بەهەمان شێوە تۆمەتی کاهینایەتیان دایەپاڵ.،وەلێ پەروەرێن وەلامی دانەوە و فەرمووی(فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ)[٨]

نمونەی یەکێك لەو تاوانبارکردنە بێ مانا و مایەپوچانەدا، گومان دەربارەی هاوسەرگیری پێغەمبەری خودا(ﷺ)یە ، ئەو گومانانەش بەشێکی زۆریان درۆی بێ ئەصڵ و بنەرەتە و،بەشێکیشی گومانە لای کەسانێك کە خودانی عیلم و ماریفەت نین..

[٦] الحجر ٦
[٧] الأنبياء ٥
[٨] الطور ٢٩

بۆ ڕەتکردنـەوەی ئـەو گومانـە مایەپوچـانە دەربـارەی هاوسـەرگیری پێغەمبـەری خودا(ﷺ)، ئەم لێکۆڵینەوە سادە و موتەوازیعەم نوسی.،تێیدا تیشکم خستۆتە سەر سێ گومان لای ئەوانەی زانیاریان پێی نیە:

بەشی یەکەم : هاوسەرگیری پەیامبەر(ﷺ) شـەهوەت و چـێژە لەگـەڵ ئافرەتانـدا - حاشا-

بەشـی دووەم : پابەندنـەبوونی(ﷺ) بـە سـنوری مۆڵـەتی ٤ خێـزان

بەشـی سـێهەم : جیـاوازی گـەورەی نێـوان تەمـەنی پەیامبـەر و تەمـەنی حـەزرەتی عائیشە(ﷺ)

داواکارم لە پەوەرێنی باڵادەست،ئیخلاص و ڕوشد و ڕاستیم پێ عەتا بفەرمووێ لەوەی کە دەینوسم،

بێگومان ئەو"نعم المولى و نعم النصير"ە..

د.لوقمان جامیعی

# بەشی یەکەم / هاوسەرگیری پێغەمبەری خودا( ﷺ ) شەهوەت و چێژە لەگەڵ ئافرەتاندا –حاشا-

دەروازە :[9]

تێبینی دەکرێت لەنێوان کۆمەڵی خێزانەکانی پەیامبەر(ﷺ)،لەنێوان خێزانە گەنج و پیرەکانی،کچی دوژمنی هەرە گەورە و کچی دڵسۆزترین هاوڕێی تێدایە،لەنێوانیان:هەیە خۆی تەنێ مەشغول کردووە بە پەروەردە کردن و پێگەیاندنی(بێ باوکان – هەتیوان) و تێیدایە کەوا جیادەکرایەوە بە زۆری ڕۆژووگرتن و نوێژکردنی بەردەوامی.،ئەوانە نمونەی تاکەکانی نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیە، لەو سۆنگەیەوە پەیامبەری خودا(ﷺ) نمونەیکی کرداری ناوازەی پیشانی موسڵمانانیدا بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنی دروست لەگەڵ هەریەك لەو نمونانەدا..

خێزانەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ١٢ ئافرەتن،کاتێ وەفاتی فەرموو ١٠ خێزانی هەبوو..[10]

حەزرەتی عائیشە کچ بوو،ئەوانی تر بێوەژن بوون،خاتوو ماریا خەڵکی میسر بوو ئەوانی تریش خەڵکی نیمچە دوورگەی عەرەبی بوون،خاتوو صەفیە یەهودی بوو،خاتوو ماریاش مەسیحی.

روونتر: شەش لەوان قورەیشی بوون(خەدیجەو عائیشە و حفصە و ام حبیبە و ام سلمە و سەودەی کچی زمعە)ڕەزای خودا لەسەر هەر هەموویان بێت..

چواریشیان عەرەب بوون(زەینەبی کچی جەحش لە بەنی خزیمە، و مەیمونەی کچی حارسی هیلالی و زەینەبی کچی خزیمە لەبەنی صعصعە و جوریرەی کچی حارس لە بەنی

[9] ینظر: السيرة النبوية والدعوة في العهد المدني: ص١٣٥، حياة محمد ورسالته: ص٢٥١– ٢٥٥.

[10] بە بڕوای نوسەر پەیامبەر(ﷺ) هیچ جاریەی نەبووە بەڵکو ماریەی ئازاد کردووە بۆیە بە خێزانی دەیەم دەژمێردرێت لە کاتی مردنی..

موستەڵەق.، وە جگە لە عەرەبەکان (صەفیەی کچی حەیی کچی ئەختەب لە بەنی نەزیر وە ماریەی کچی شەمعون).

لەکاتی وەفاتی دا(ﷺ) خودانی ١٠ خێزانان بووە، خاتوو خەدیجە و خاتوو زەینەبی کچی خوزەیمە،کاتێ پەیامبەر(ﷺ) خۆی لەژیاندا بوو ئەوان وەفاتیان فەرموو، دابەش دەکرانە سەر ١٠ دوای ئەوەی خاتوو سەودە شەوی خۆی بە حەزرەتی عائیشە (رضي الله عنها) بەخشی،یەکەمین خێزانی کە دوای وەفاتی پێی گەیشتبێت خاتوو زەینەبی کچی جحشە،کۆتاشیان أم سلمەیە (خودا لە هەمووان رازی بێت).

بۆ رەواندنەوەی گومانەکان و باسی کۆمەڵە حەقیقەتگەلێك و حوکمی هاوسەرگیری پەیامبەر(ﷺ) و هەندێ شتی تر دەکەین بە دوو لق:-

## لقی یەکەم / کۆمەڵە حەقیقەتێك و حوکمگەلێکی گرنگ[11]

دەکرێت کەوا ژیانی خێزانی پەیامبەری خودا(ﷺ) دابەش بکرێتە سەر چوار بەش کە پەیامبەر تێیدا ژیاوە،کە لە هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو خەدیجە(رضي الله عنها)ی یەکەم خێزانیەوە دەست پێدەکات، و لە هێنانی خاتوو مەیمونە(رضي الله عنها) تاوەکو وەفاتی کۆتایی پێدێت.،ئەو چوار بەشە بەم شێوەیە دابەش دەبن:

فەترەی یەکەم: دەستی پێکرد کاتێك پەیامبەر(ﷺ)هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو خەدیجە(رضي الله عنها) دا کرد، لەو کاتدا رەسولی سەروەر تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو، و بەردەوام بوو تاوەکو وەفاتی خاتوو خەدیجە(رضي الله عنها) و تەمەنی پێغەمبەری خودا ٥٠ ساڵ بوو،ئەم سەروبەندە تەمەنی گەنجی پەیامبەری خودایە(ﷺ) و ماوەی ٢٥ ساڵی خایاندووە.

فەترەی دووەم: لە وەفاتی خاتوو خەدیجە(رضي الله عنها) — و تەمەنی ٥٢ سـ ـڵی رەسول-ەوە دەست پێدەکات، کاتێك کە هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو سودەی کچـ ـی زمعەدا کرد و

[11] ینظر: تثبیت دلائل النبوة: ٢/٦٥٠- ٦٥٢، حدائق الأنوار ومطالع الأسرار في سيرة النبي المختار: ص٣١٦- ٣٢٠، القول المبين في سيرة سيد المرسلين: ص٤٠٠- ٤١٢، نور اليقين: ص٥٨، السيرة النبوية والدعوة في العهد المدني: ص١٣٨- ١٥٤.

بۆماوەی ۳ ساڵان دەگەڵی دا ژیا، کۆتایی پێهات لە دوای هیجرەتەوە بە یەك ساڵ،لەم سەرویەندەدا پەیامبەری خودا تەمەنی ٥٤ ساڵ بوو.

فەترەی سێهەم: بۆ ماوەی ٦ ساڵان بەردەوام بوو،لەو کاتەوەی کە تەمەنی پەیامبەری خودا(ﷺ) ٥٤ ساڵ بوو تاوەکو گەیشتە تەمەنی ٦٠ ساڵی، و لەم ماوەیەدا پەیامبەر هاوسەرگیری لەگەڵ ژمارەێك لە دایکانی ئیمانداران کردووە،و لە کاتی وەفاتیدا ١٠ یان زیندوو بوون، و خاتوو مەیمونە کۆتا ئافرەت بوو کە پەیامبەری خودا(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد.

فەترەی چوارەم: لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە پەیامبەر گەیشتە تەمەنی ٦٠ ساڵان تاوەکی وەفاتی لە ٦٣ ساڵیدا،لەم فەترەیەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵ هیچ ئافرەتێك نەکرد،خودای باری تەعالا هاوسەرگیری لە پێغەمبەر(ﷺ) حەرام کرد و فەرمانی پێ فەرموو کەوا هیچ کامیان تەڵاق نەدات.

کاتێك رادەمێنین لە فرەژنی پەیامبەری سەردارمان(ﷺ) و بەتایبەتی لەو تەمەنە دیاری کراوەی رەسولی خودا(ﷺ)،تێبینی دەکەین کەوا..:-

١-پەیامبەر(ﷺ) تاوەکو تەمەنی ٢٥ ساڵی لەنێو ژینگەی جاهیلیەت و بەسەڵتی ژیاوە دڵپاکێکی بێ حەز و ئارەزوو،بێ ئەوەی لە هیچ کام لەو تەوژمە فاسید و بۆگەنانەی دەورویەری نزیك ببێتەوە.

٢-هاوسەرگیری کرد و تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو بە ئافرەتێك کە ١٥ ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو،پێش ئەویش دوو مێردی دیکەی کردبوو،لەوانیش ۳ منداڵی هەبوو.

۳-ژیانی هاوسەرایەتی لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا(رضي الله عنها) بەردەوام بوو تاوەکو وەفاتی لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا،

پەیامبەری خودا(ﷺ) ئەو کات لە تەمەنی ٥٠ ساڵی نزیك ببوویەوە بێ ئەوەی بیر لە هاوسەرگیری لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی تردا بکاتەوە،لەگەڵ ئەوەی کەوا لە تەمەنی ٢٠ ساڵی تاوەکو ٥٠ ساڵی تەمەنی جوڵانی رەغبەت و حەزە بۆ خێزانداری(چون ئەم کاتە

کاتی گەنجیە)..پەیامبەری خودا(ﷺ) زۆربەی خێزانەکانی لە دەیەمی شەشەمی ژیانیدا هێناوە،لەم تەمەنەی کە غەریزەی رەگەزی مرۆڤی ئاساییش کە هیچ تێفکرینێك مەشغولی نەکات لاواز دەبێت،چ جای پەیامبەری خودا کە هەڵگری مەزنترین ئەمانەتە..کاتێ پەیامبەر(ﷺ) ئیمامەتی مەزنی پێ بەخشرا،هەموو کات و ساتێکی و هەموو خولەکێکی ژیانی بیرکردنەوە بوو لە چۆنیەتی گەیاندنی پەیامی رەبولعالەمین و ریعایە و چاودێری کردنی ئومەتەکەی؟دەبێت چ توانایکی بۆ بمێنێتەوە تا لە خۆیدا سەرفی بکات؟یاخود کاتەکانی بەسەر خێزانەکانیدا دابەش بکات؟

٤-دوای حەزرەتی خەدیجە(ﷺ) رەسولی ئەکرەم(ﷺ) ل تەمەنی ٥٢ ساڵیدا هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو سودەی کچی زمعە کرد،کە لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا بوو، خاتوو سودە یەکەمین بێوەژن بوو لە ئیسلامدا،لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هیجرەتی کرد بۆ حەبەشە بە مەبەستی رزگار بوون لە دەستی زوڵم و زۆرداری و ستەمی قورەیش، هاوسەرەکەیشی شەهید بوو لە کاتی گەرانەوەیاندا،خزم و کەس و کاریشی هەر لەسەر بێباوری بوون،ئیدی ئەگەر بگەرابایەوە لە ئاینەکەی هەڵیاندەگەراندەوە بۆ ئاینی خۆیان،بۆیە پەیامبەری خودا(ﷺ)هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی:

أ-پاراستنی ئاینەکەی لە فیتنە .

ب- رێز و شکۆێك بۆ ئەو و،ئەو ئافرەتانی هاو حاڵی ئەون.

٥-پەیامبەری خودا(ﷺ) لەساڵی دووەمی کۆچی یاخود روونتر لە کۆتایەکانی یەکەمی کۆچیدا و لە تەمەنی ٥٥ ساڵیدا هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو عائیشەدا کرد.

حیکمەت لەم هاوسەرگیریە:-

أ-میراتگری ی ئیسلام و دابەزینی بنەما و ئەحکامەکانی بێت کە لە پەیامبەرەوە(ﷺ) وەریگرتبوو،چون خاتوو عائیشە گەنج و زیرەکە و زۆر و زوو شت فێردەبێت،ئیدی خاتوو عائیشە ٤٢ ساڵ ژیا لەدوای پەیامبەرەوە،

سەرقاڵ بە بڵاوکردنەوەی عیلم..،

ب- رێز و شکۆێك بۆ باوکی(حەزرەتی ئەبوبەکر – رضي الله عنه)

ج-پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ هاوەڵانیدا کە دەبێتە هۆکارێك بۆ یەکگرتوویی ئومەت،بۆ نمونەش هاوسەرگیری لەگەڵ کچی ئەبوبەکر و کچی عومەر، و بەشوودانی کچەکانی بۆ عوسمان و عەلی (رەزای خودا لەسەر هەر هەموویان بێت)

٦-رەحم و میهرەبانی لەگەڵ بێوەژناندا(ئەرمەلە)وەك خاتوو سودەی کچی زمعە و خاتوو أم سلمه و خاتوو أم حبیبه و هتد، و وەفادارێك بۆ هاوسەری بەشێك لەوانەی شەهید بووبوون لە جەنگ و شەرەکان لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دا.

٧-مەحەبەتی(ﷺ) بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ هەموو ناوچەکانی زەوی،چون ویستی لەگەڵ هاوسەرگیری خاتوو ماریا قبتیدا پەیوەندی لەگەڵ وەلاتێکدا دروست بکات و خاتوو جویرەش بە هەمان شێوە تاوەکو بەنی مصتلق موسڵمان بن(کە دیل بوون لەلای موسڵمانان لە غەزای بەنی مصتلقدا.،و خاتوو صەفیەش بۆ نزیکبوونەوە لەگەڵ یەهودیەکاندا.

٨-لەپێش پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەریەك لە پەیامبەران ئیبراهیم و یەعقوب و داود و سولەیمان(سەلامی خودا لەسەر هەموویان بێت)فرەژنیان ئەنجام داوە، تەنانەت بەبەڵگەی باسکراویش لەنێو کتێوە ئاسمانیەکاندا.، دەپرسین ئەی بۆچی رۆژئاوا هێرش دەکاتە سەر پەیامبەرمان(ﷺ) بەو تۆمەتە؟

٩- فەترە و زەمەنی فرەژنی ٦ساڵی خایاندووە،ئەو کاتەی پەیامبەری خودا(ﷺ)لەنێو تەمەنی پیری و بەساڵاچووندا بووە، ئەو ٦ ساڵە پڕ بووە لە دابەزینی زۆربەی قورئان و بەیانی ئەحکامی شەرعی و بونیاتنانی دەوڵەتی ئیسلامی و بزوتنەوە و جوڵانی ئیسلام لەنێو خەڵکیدا و هەستان و ئەنجامدانی شەر و غەزاکان و پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە و پێشوازی کردی وەفدەکان لە هەموو جێگایێکەوە و ناردنی نامەو پەیام و تەبلیغی دەعوەی کرداری بۆ هەموو جیهان..

١٠- خێزانەکانی پەیامبەری خودا(ﷺ) هەموویان بێوەژن بوون، واتە پێش پەیامبەری خودا(ﷺ) هاوسەرگیریان کردبوو، تەنێ حەزرەتی عائیشە(رضي الله عنها)نەبێ،کە

پەیامبەر بە فەرمانی باری تەعالا(جل جلالە) هێنـای و نەیگواستەوە تـاوەکو سـاڵێك لەدوای هیجرەتەوە نەبێت.

١١-هیچ کام لە یەهودیەکان یاخود مونافیقەکان یانیش بێ باوەڕانی مەککە ڕەخنەگر نەبوون لەسەر هاوسەرگیری پەیامبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ ئـەوەی خوازیـاری دۆزینـەوەی ڕەخنەیێك یاخود هەڵەیێك بوون لێی بۆ بڵاوکردنـەوەی لـە جیهانـدا،وەلێ دەبینین لەگـەڵ دوژمنایەتیشیان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)هیچ قسـەیێکیان لـەبارەی هاوسـەرگیری ئـەو نەکردووە و تەنانەت شایەتی پاکی و چاکییان بۆ داوە.

ئەم تێبینیانەنسەلمێنەری حەقیقەتێکی ڕوونن، بەوەی کـەوا پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) بەهیچ جۆرێك کەسێکی شەهوانی نەبووە،وەکو ئەوەی کە بەشێك لە دوژمنـانی ئیسـلام باسی دەکەن، چون ئەگەر کەسـێکی شـەهوانی بووایـە ئـەوا هـەر لـە سـەرەتاوە و لـە هاوسەرگیری یەکەمەوە کچێکی سەڵتی گەنجی هەڵدەبژارد و لەدوای ئەویشەوە دەیتـوانی هاوسەرگیری تریش بکاتەوە،چونکە کۆمەڵگای جاهیلیەت فرەژنی بێ سنور و ئەنـدازەی ئەنجام دەدا،

پەیامبەری خودا(ﷺ)پێش هـاتنی نبووەت"ڕیسـالەت"کاتی هـەبوو بـۆ تێرکردنـی شەهوەتی،لەجیاتی ئەوەی لە دووری خەڵك و لە خەڵوەتەوە بەسەری ببات..لەتەنانەت گەر پەیامبــەری خــودا(ﷺ)ویســتی شــەهوەت تێرکردنــی هەبووایــە لــەو ڕۆژگــارەدا (لەشفرۆشان)ناسراو بوون و شوێنی دیاریکراویـان هـەبوو،توانای پەیوەنـدی پێـوەکردنی پێیانەوە هـەبوو چـون تەنانـەت کۆمـەڵگاش زەمینەسـاز بـوو بـۆ ئـەو کردارە.،وەلـێ پەیامبەر(ﷺ) هەرگیز وانەبووە، بەڵکو بە پاك و خاوێنیەوە ژیاوە،و تۆمەتبار نـەکراوە لەلایەن دوژمنەکانیەوە لە ڕووێکی ئاواوە.،بەڵکو ژیانی بە ڕاسـتگۆیی و دەسـتپاکیەوە بەسەربرد..

و لە دوای وەفاتی خاتوو خەدیجەوە(ﷺ)پەیامبـەر(ﷺ) هاوسـەرگیری کـرد لەگـەڵ خاتوو سەودە(ﷺ) لە مەککەدا،

کە بێوەژنێکی بەساڵاچوو بوو، و بەتەنیا لەگەڵیدا ژیا بۆ ماوەی ٤ ساڵان،خۆ ئەگـەر پەیامبەری خودا(ﷺ) هەر کچێکی سەڵتی جوانی موسـڵمانی ویسـتبا، ئـەوا کچـە و

قەومەکەشی دڵخۆش دەبوون.،وەلێ هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو سەودەیا کرد،بۆ ئەوەی دونیا بزانێت،کە غایەت و ئامانج هیچ کاتێك تێرکردنی شەهوەت و حەز و ئارەزوو نیە.

## لقی دووەم /دایکانی ئیمانداران و کۆمەڵە حوکمگەلێك دەربارەی هاوسەرگیری پەیامبەر(ﷺ) پێیانەوە[12]

١-خەدیجەی کچی خویلدنیەکێك بوو لە خانەدانانی قورەیش،لە رووی نەسەبەوە نزیکترین خێزانی پەیامبەرە(ﷺ) کاتێك کەمن سەیری ئەم هاوسەرگیریە مویارەکە دەکەم وەکو فەرمانێکی خودای باری تەعالا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەیبینم.،تەنانەت گەر لەو کاتیشدا پەیامبەر(ﷺ) وەحی بۆ نەهاتبێت لەلایەن خوداوە،لێ خۆ خودا عالمی غەیبە و موحەمەد وەکو خاتەم بۆ پەیامبەران دەستنیشان کراوە و دەکرێت بە پەیامبەر ،بۆیە پێویستی بە پاڵپشتێکی بەهێزی ماددی و مەعنەوەی هەیە.،ئەمانەش لە خاتوو خەدیجەدا(رضي الله عنها) دەهاتە جێ،پەیامبەری خوداش(ﷺ) ئاماژەی پێداوە،کاتێك کە عائیشە(رضي الله عنها) پێی گوت: ئەی ئەو تەنها پیرێك نەبوو کە خودا بە باشتر قەرەبووی کردیەوە(مەبەستی خۆی بوو)،پەیامبەری خوداش تورە بوو و فەرمووی: نا سوێند بەخودا،خودا بەباشتر قەرەبووی نەکردوومەتەوە،چون ئەو باوەری پێم هێنا کاتێك کە خەڵکی پشتیان تێکردم،و بەراستی لەقەڵەمی دام کاتێ کە خەڵکی بەدرۆیان خستمەوە،و پاڵپشتم بوو بە پارەکانی کاتێ کە خەڵك لەسەرم حەرامیان کرد،و خودا لەو منداڵی پێ بەخشیم.[13] خاتوو عائیشە گوتی: ئیدی لەدوای ئەوەوە هەرگیز بە خراپە باسم نەکردەوە.

---

[12] ينظر: مستعذب الإخبار باطيب الأخيار: ص١٠٦- ١١٨. تثبيت دلائل النبوة: ٢/٦٥٠- ٦٥٢. الروض الأنف في شرح السيرة النبوية لابن هشام: ٧/١٦٠- ١٦٣. حدائق الأنوار ومطالع الأسرار في سيرة النبي المختار: ص٣١٦- ٣٢٠. السيرة النبوية على ضوء الكتاب والسنة: ٢/٣٨٧. القول المبين في سيرة سيد المرسلين: ص٤٠٠- ٤١٢. السيرة النبوية والدعوة في العهد المدني: ص١٣٨- ١٥٤. مرويات غزوة بني المصطلق وهي غزوة المريسيع: ص٣٥١. السيرة النبوية عرض وقائع: ص٢٠٨.

[13] سبق تخريجه.

پەیامبەری خودا لەو شەش منداڵی هەبوو: قاسم و عەبدولاّ (تەیب و تاهیر)کە مردن پێش هاتنی پەیامی ئیسلام، و رقیە و ام کلسوم و زەینەب فاتیمە،کە هەموویان لە پێش وەفاتی پەیامبەری خوداوە(ﷺ) گەرابوونەوە بۆلای جەنابی حەق تەعالا،تەنها فاتیمە نەبێت کە ٦ مانگ لە دوای وەفاتی پەیامبەرەوە(ﷺ) وەفاتی کرد.

٢-سودە کچی زمعە: بێوەژنێکی بەساڵاچووی تەمەن ٨٠ ساڵ،هاوسەرەکەی لەیەکێك لە شەرەکاندا لە دوای گەرانەوە لە هیجرەتی حەبەشەوە شەهیدکرا،و خزم و کەس و کاریشی هەر لەسەر بێ باوەری بوون،بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ)هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد وەکو وەفایێك بۆ هاوسەرەکەی و بۆ پاراستنی ئاینەکەیشی و پاراستنی لە گێژەلووکە و فیتنە و بەلاّ و موصیبەت،و گرنگی دانێك بە ئافرەتانی تێکۆشەر بەتایبەتی.

٣-عائیشەی کچی ئەبوبەکر: تەمەنی لەنێوان (١٥-٢٥)ساڵیدا بووە..،هاوسەرگیری لەگەڵیدا،حوکمگەلێکی گرنگی تێدایە،وەکو:-

أ-پەیامبەر(ﷺ) لە خەودا هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا بینی بوو،چونکە لە هەردوو صەحیحەکەدا سەلمێنراوە و لە فەرموودەیێك لە زاری حەزرەتی عائیشەوە(رضي الله عنها) دەگێردرێتەوە کەوا پەیامبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووە(تۆم لە خەودا سێ جار بینیوە کەلەنێو پارچەیێك لە قوماشی ئاوریشمدا بوویت،پێم گوترا ئەمە خێزانی تۆیە،کاتێك کە قوماشەکەم هەڵدایەوە بینیم تۆی،منیش گوتم گەر ئەمە لە خواوەیە رازین)[١٤].

ب- پەیامبەر(ﷺ) لەسەردەمی منداڵی عائیشەدا،تێبینی زیرەکی و زیندووی ئەوی کرد،بۆیە حەزی کرد کەوا هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات بۆئەوەی کەسێکی خودان توانای زیاتر بێت بۆ گواستنەوە و بەیانکردنی حاڵ و قاڵی پەیامبەر(ﷺ)،هەر بەراستیش وا

[١٤] رواه البخاري ومسلم واللفظ له.

دەرچوو،چـــون حـــەزرەتی عائیشـــە(ﷺ)لـــەدوای وەفـــاتی پەیامبـــەر بـــوو بـــە مەرجەعێك بۆ هاوەڵان لەکاروبار و ئەحکامیان.

ج-مەحەبەت و خۆشەویستی پەیامبەر(ﷺ) بـۆ بـاوکی عائیشـە خاتوون،حـەزرەتی ئەبوبەکر(ﷺ)کە رەزامەندی خودای لەپێناوی دەعـەوە و بانگـەوازی حەقـدا و سـەبر و ئارامگرتن لەسەر ئەو ئازارانەی دراوە وەدەستهێنا، بەراستی چون ئەو خودان بـەهێزترین ئیمان بوو لەنێو خەڵکی دا،و لە هەموویان راستگۆتر بوو لەدوای پەیامبەرانەوە سەلامی خودایان لەسەر بێت.

٤-حەفصەی کچی عومەر: هاوسەرەکەی(خنیسی کوری حدافە)لە یەکێك لە جەنگە ئیسلامیەکان پلەی شەهادەتی وەدەستهێنا،باوکی ویستی پێشکەشی حەزرەتی ئەبوبەکر و عوسمان(رەزای خودایان لێبێت)بکات،لێ داوی لێبوردنیـان کـرد لـە وەرگرتنی،لـە دوای ئەوەی پەیامبەری بەسۆز(ﷺ)بەوەی زانی کە حەزرەتی عومەر(ﷺ) بێتاقەت و دڵتەنگ بووە بە رەتکردنەوەی لەلایەن حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عوسمانەوە،پەیامبـەر(ﷺ) رێز و شکۆیێك بۆی و رەحم و میهرەبانییێك و وەفادارێـك بـۆ هاوسەرەکەی،هاوسـەرگیری لەگەڵدا کرد.

٥-ام حبیبە(رملەی کچی ئاباسوفیان): ئەو لەگەڵ هاوسـەرەکەیدا(عـبداللە ی کـوری جحش)سەفەری کرد بۆ حەبەشە،لەوێدا عـبداللە داخڵی ئاینی مەسیحیەت بوو و بـوو بـە مەسیحی،ئیدی ئەوکات ام حبیبە لەنێوان دوو شت دابوو:

أ-یان بگەرێتەوە لای باوکی کە ئەوکات دوژمنی پەیامبەر(ﷺ)بوو و لەجەنگدا بوو لەگەڵیدا.

ب-یاخود ئاینەکەی بگۆرێت و توشی فیتنە بێت.

بۆیە پەیامبەری خودا(ﷺ) نێردراوێکی نارد بۆ حەبەشە بۆ ئەوەی مارەی بکات بـۆ پەیامبەر(ﷺ)،و نەجاشیش ٤٠٠ دیناری مارەیی پێ بەخشی ، پەیامبەری خـودا(ﷺ) چەند هەدەف و ئامانجێکی هەبوو لەم هاوسەرگیریەدا:

أ-پاراستن و پارێزگاری لێکردنی لە شیرك و بێ باوەری.
ب-کەمکردنەوەی دوژمنایەتی بەنی ئومەیە بەگشتی و سەرکردەکەیان(ئەبوسوفیان) بەتایبەتی بەرامبەر بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان،هەرواش بوو ئەبوسوفیان کاتێ کە خەبەری پێدرایەوە دڵخۆش بوو.
ج-موتابەعەکردن و چاودێری کردنی پەیامبەری خودا(ﷺ) بۆحاڵ و باری کۆچبەران و بەشداری کردن لەبەلاّ و موسیبەتەکانیاندا.
د-راگرتنی دڵ و دەروونی ئارامگران، و شکۆدارکردنی بێوەژنان.
٦-زەینەبی کچی خزیمە(دایکی هەژاران): لەژێر کۆیلایەتی عبیدەی کوری حارث کاتێ کە شەهیدکرا لە غەزای بەدر و لەکاتی موبارەزە –زۆرانبازی-کردندا،ئەم خاتوونە رێزدارە بەدایکی هەژاران بانگ دەکرا بەهۆی خۆشەویستی و عەتف و میهرەبانی زۆری بەرامبەریان.
پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد کاتێ کە تەمەنی ٦٠ ساڵان بوو..
أ-عەتف و میهرەبانییێك بۆی و دڵدانەوەی.
ب-هاندانی بۆیارمەتی دانی زیاتری هەژاران.
ج-و قەرەبووێك بۆ ئەوەی بەسەریداهات.
د-پارێزگارییێك بۆ ئاینەکەی
و-و لە خۆگرتنی منداڵەکانی و بەخێوکردنیان
ه-و تەعویز و قەرەبووێك لەسەرهاوسەرەکەی کەلەجیهادا شەهیدکرا
٧-زەینەبی کچی جەحش: (کچەمامی پەیامبەر(ﷺ) – أمیمەی کچی عبدالمتلیب)لەدوای گرتنی زەیدی کوری حارپ، پەیامبەری خودا کردی بە کوری خۆی و ناوی نا زەیدی کوری موحەمەد،ئەوەی بەلاوە خۆشتر بوو کەوا بە کۆیلایەتی لای پەیامبەر بژیت لەوەی بە ئازادی لەلای خێزانەکەی خۆیدا بژی.، پاشان پەیامبەری خودا(ﷺ)بریاری ژنهێنانی بۆ زەیدا،جوانترین کچی بۆ

هەڵبژارد،لەبەرزترین و خانەدانترین ماڵەکانی قورەیش و خودان پایەبەرزترین نەسەب،پەیامبەری خودا(ﷺ)مەبەستی لەم هەڵبژاردنەدا تێکشکاندنی ئەو کۆت و زنجیرە بوو کە جاهیلیەت بەسەر کۆیلەکانیدا چەسپاندبووی،چون مافی هاوسەرگیریان بە کەسێکی ئازاد نەبوو،و تەنانەت مافی دڵخۆش بوون بەژیانیشیان نەبوو،سەرەتا زەینەب ڕازی نەبوو،براکەشی بەهامان شێوە،لێ ئاسمان قسەی خۆی کردبوو: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا)[١٥]،

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن ئەوان سەرپشك بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە.

خودای گەورە ویستی بەم هاوسەرگیریە حیکمەتێکی فرە مەزن بگەیەنێت،ئەویش ڕووخاندنی شانازی کردن بە نەسەب و چەسپاندنی یاسایێکی نەمر(إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)[١٦]

بەڵام هاوسەرگیریەکە سەرکەوتوو نەبوو،خودای تەعالا دەیویست ئەو عادەتە جاهیلیە بەمیرات مایەوە بڕوخێنێت بە بابەتی تەڵاق و دووبارە مارەکردنەوەی لە پەیامبەری خودا،بۆیە پەروەرێن بە پەیامبەرەکەی فەرموو: کەوا زەینەب دەبێت بە خێزانی لەدوای تەڵاق وەرگرتنی لە زەیدەوە،پەیامبەری خودا(ﷺ)توشی شۆك بوو بەم هەواڵە،چونکە ئەمە زاری مونافیقان واڵادەکات، بۆیە هەواڵەکەی نەگەیاند،وەلێ ئیرادە و ویستی پەروەردگاری باڵادەست لەسەرو هەموو شتێکەوەیە،بۆیە پەروەرێن پەیامبەرەکەی ئاگادارکردەوە لە نەشاردنەوەی هەواڵەکە و هاسەرگیری لەگەڵ زەینەب لەدوای تەلاق

---

[١٥] الأحزاب ٣٦

[١٦] الحجرات ١٣

وەرگرتنی لە زەیـدەوە (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّـهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّـهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّـهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّـهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّـهِ مَفْعُولًا)[17]

واتە: تۆ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) کـاتێ بـەو کەسـەی کـە (زیـد) ەو خـوا نیعمەتی ئیمانی پێبەخشیوە، تۆش نیعمەتی ئازادیی و پەروەردەت لـە نزیکـی خۆتـەوە پێداوە دەڵێت: هاوسەری خۆت بهێڵەرەوە لای خـۆت کـە (زەینـەب)ە، لـە خـوا بترسـەو (تەڵاقی مەدە)، وە شتێك لە دڵ و دەروونی خۆتدا دەشاریتەوە کە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات، لە خەڵکی دەترسیت، (لەبەر ئەوە) کاتێ کە زەید خواستی و بـوو بـە هاوسـەری (پاشان ڕێك نەکەوتن و جیابوونەوەو تەڵاق کەوتە نێوانیان)، ئێمە (زەینەب)مان لـە تـۆ مارەکرد، بۆ ئەوەی هیچ جێ پێ لێژبوون و دڵتەنگییەك بۆ ئیمانداران دروست نەبێت، لە هێنانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان کاتێك کە پێشتر هاوسـەرو حـەڵالیان بـوون، فـەرمانی خواش دەبێت جێبەجێ بکرێت.

گـەر پەیامبـەری خـودا(ﷺ)کەسـێکی شـەهوانی بووایـە-وەحاشـا-،بۆچـی خـۆی هاوسەرگیری لەگەڵ نەکرد پێش زەید؟

*ڕۆژئاوایەکان گومانێکی دوور لـە ڕاسـتی و بەمەبەسـت دەوروژێـنین کـە دەڵێـن: پەیامبەر(ﷺ)چوو بۆ ماڵی زەید، خێزانەکەی زەیدی بە جلـی ماڵـەوە بـینی و خۆشـی ویست و کەوتە نێو دڵی – حاشا- ،وکاتێ زەید هەستی بە ڕەغبەت و حـەزی پەیامبـەر کرد بۆ خێزانەکەی ویستی تەلاقی بدات،ئەوکاتیش پەیامبەر(ﷺ)خۆی وا دەرخست کە ناڕازیـە و پێـی گـوت:- لەگـەڵ خێزانەکـەت بـە و لەخوابترسـێ، بەڵـێ لـەنێو دڵیـدا

[17] الأحزاب ٣٧

خۆشەویستی و ڕەغبەتی خۆی دەشاردەوە،تاوەکو خودا وەدەریخست،و ئەو دەترسا لە خەڵکی لە ئاشکراکردنی خۆشەویستی بۆی و هتد..

بەو کەسانە دەڵێین:- ئەم قسانە لەگەڵ سیاقی ئەم ئایەتە پیرۆزە یەکناگرێتەوە،چون لە خیتامی ئایەتەکە نهێنی ویستی خودای تەعالا وەدەردەکەوێت، کەوا پەیامبەرەکەی خۆی(ﷺ)مولزەم کردووە بەم هاوسەرگیریە،چون خودای باری تەعالا دەفەرمێت:..زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا)[18]

واتە:- ئێمە (زەینەب)مان لە تۆ مارەکرد، بۆ ئەوەی هیچ جێ پێ لێژبوون و دڵتەنگییەك بۆ ئیمانداران دروست نەبێت، لە هێنانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان کاتێك کە پێشتر هاوسەرو حەڵالیان بوون، فەرمانی خواش دەبێت جێبەجێ بکرێت.

واقع و حەقیقەتەکە ئەوەیە کەوا خودای -عز وجل- ویستی زەینەبی کچی جحش(ﷺ) ببێتە جێبەجێکارێکی کرداری بۆ یەکێك لە مەبدەئەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام،ئەو مەبدەئەی ئەوە دەروخێنێت کەوا عەرەب لەسەری بوون لە سەردەمی جاهیلیەتدا،و هەروەها هاوسەرگیری کردن لەگەڵ هاوسەری کوری لەخۆگیراودا لەدوای تەڵاق دان حەرام نابێت بۆ باوکی کورەی لەخۆگیراو،و بڕیاردرا لەسەر ئەوەی زەید هاوسەرگیری لەگەڵ زەینەب بکات لەگەڵ ئەوەی مەبدەئی باسەکەیان ڕەتدەکردەوە و ڕەزامەند نەبوون لەسەری،وەلێ ناچاربوون بە ڕازی بوون لەدوای دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە : (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا)[19]

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن ئەوان سەرپشك بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی

---

[18] الاحزاب ٣٧

[19] الأحزاب ٣٦

سەرپێچی بکات لـە فـەرمانی خـواو پێغەمبەرەکـەی ئـەوە ئـیتر بـە ئاشـکرا گـومڕاو سەرلێشێواوە.

دواتریش بڕیاردرا پەیامبەری خودا بیهێنێت لەدوای تەڵاقی زەیدەوە..

وەلێ کاتێك کە خودا دەفەرموێ (وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ - شتێك لە دڵ و دەروونی خۆتدا دەشاریتەوە کە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات،) مانای ئەوە ناگەیەنێت کەوا پەیامبەر(ﷺ) خۆشەویستیەکەی خۆی شاردبێتەوە و بۆ زەیـد وەدەرینەخسـتبێت، بەڵکو بەمانای ئەوەدێت کەوا فەرمانی خودای بە هاوسەرگیری لەگەڵیـدا دەشـاردەوە،لە ترسی خەڵك، واتە لە قسەی خەڵك دەترسا کە بڵێن موحەمەد(ﷺ)هاوسەرگیری لەگـەڵ هاوسەری کوری لەخۆگرتووی دەکات[20]، سەلمێنەری ئەم قسەیەش ئەمەیـە کـەوا خـودای تەعالا دەفەرمووێت(زوجناكها)یانی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودامان بەسـەردا چەسـپاندی، لەگەڵ ئەوەی لە دەرەنجامی ئەم هاوسەرگیریە دەترسیایت و ڕەغبەتت لەسەری نەبوو.[21]

٨-أم سلمە(هندی کچی أمیەی کوری المغیرە): بێوەژنێکی پیری خودان ٤ منـداڵ لـە پێشینانی ئیسلام بوو، هیجرەتی کـرد بـۆ حەبەشـە بەمەبەسـتی ڕزگـاربوون لەدەسـتی قورەیش لەپێناو دینەکەیدا،و ئەو یەکەمین ئافرەتی موسڵمان بوو کە هیجرەتـی فـەرموو لەپێناوی خودادا،هاوسەرەکەی(عبدالله ی کوری ئەسەد)لە غـەزای بـەدردا برینـداربوو و دواتریش وەفاتی کرد و پلەی شەهادەتی وەدەست هێنا، لە سەرەمەرگیدا داوای لێکـرد کەوا شوویکاتەوە لەدوای ئـەو، بەکەسـێکی موخلیصـی باشـتر لـەخۆی بـۆ خزمـەت و

---

[20] قال القرطبي في تفسيره – بعد أن ذكر هذا التفسير –: قال علماؤنا: وهذا القول أحسن ما قيل في تأويل هذه الآية، وهو الذي عليه أهل التحقيق من المفسرين والعلماء الراسخين، كالزهري، والقاضي بكر بن العلاء والقاضي أبي بكر بن العربي وغيره. ثم قال القرطبي: وأما ما روي من أن النبي ﷺ هوى زينب، وربما أطلق بعض المجان لفظ العشق. فهذا إنما يصدر عن جاهل بعصمة النبي ﷺ عن مثل هذا أو مستخف بحرمته...

ينظر: الجامع لأحكام القرآن: ١٤/ ١٩١

[21] كالبيضاوي والسيوطي وابن كثير وغيرهم.

ينظر: أنوار التنزيل وأسرار التأويل: ٢٢٢/٤، الدر المنثور: ٦١٤/١، تفسير القرآن العظيم: ٣٧٧/٧.

چاودێری کردنیان، پەیامبەری خوداش(ﷺ) کە بینی ئەو خاوەن منداڵە و پێویستیان بە کەسێکە کەوا ریعایەت و چاودێریان بکات و ئەو و هاوسەرەکەی لە کۆچبەران بوون و هەمیش ئەو هاوسەرەکەی نەما و خزم و کەس و کاریشی بەهەمان شێوە،بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد بۆ پاراستنی و ریعایەتی منداڵەکانی و شکۆیێك بۆ تێکۆشانی.

٩-صەفیەی کچی حیی کوری اختب(نێردراوێکی مەملەکەتی یەهود): هاوسەرەکەی(کنانی کوری رەبیع) قاشای یەهود بووە، بە دیل گیرا لەدوای فەتحی خەیبەرەوە،و باوك و براکەی و هاوسەرەکەی کوژران لە جەنگەکەدا،وەکو میهرەبانییەك و رەحمێك بۆی،پەیامبەری خودا(ﷺ) سەرپشکی کرد لەنێوان دوو شت یان ئازاد بکرێت و بچێتەوە نێو قەومی خۆی گەر ویستی بەردەوامیەتی لەسەر یەهودیەت هەبێ، یاخود هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات گەر موسڵمان ببێت،صەفیە خاتوونیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا من ئیسلامم قبوڵ کرد و باوەرم بەپێغەمبەرەکەی هێنا پێش ئەوەی بانگم بکەیت،تۆ منت سەرپشك کرد لەهەڵبژاردنی کوفر و ئیسلام،لێ خودا و پێغەمبەرەکەی خۆشەویسترن لە ئازادی و گەرانەوە بۆلای قەومەکەم،بۆیە پەیامبەری خودا(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد وەکو دڵدانەوەیێك و رەحمەتێك، و ویستی لە بەندایەتی و شەرمەزاری رزگاری بکات، و پارێزگاری لەهەست و شکۆیی بکات ،و ئازادکردنی لە دیلەوە ببێت بەمارەیی بۆی،

روونە کەوا گرنگ بوو کچی پاشای یەهود هاوسەرگیری نەکات تەنێ لەگەڵ کەسێك نەبێ کە پلە و پایەی لە باوکی بەرزتر بێت،کێ لەئاستی ئەوان بەرزترە بێگومان سەرکردەی هەموو وەچەی ئادەم..کە پەیامبەری خودایە ،و گونجاو و رێگەپێدراو نیە کەوا ئەم داماوە بەجێبهێڵدرێت کەلە حاڵێکی بەرز و پر خێر و خۆشیەوە بچێت بۆلای کەسێك کە بە خراپ مامەڵەی لەگەڵدا بکات و ئازاری بدات.

١٠-مەیمونەی کچی حارث: ئـەوەی کـەوا خـۆی تـەرخان کردبـوو بـۆ پێغەمبـەری سەروەر(ﷺ)کاتێك کەزانی پەیامبەر بۆ داخوازی ئەو هاتووە و مارەیشی لەگەڵ خۆیـدا هێناوە،گوتی : مارەییەکەم با بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی بێت.،واتە خۆی پێشـکەش بـە پەیامبەر کرد بەبێ مارەیی،خوداش ئەم فەرمایشتەی دابەزیە خوارەوە کە دەفەرمووێت: (وَامْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِي أَزْوَاجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ اللَّـهُ غَفُورًا رَّحِيمًا)[٢٢]

واتە: هەر ئافرەتێکی بڕوادار کە ئەگەر ویستی خۆی پێشکەشـی پێغەمبـەر بکـات، وە پێغەمبەریش ویستی مارەی بکات، کە ئەمەیان تایبەتی تۆیە (ئەی پێغەمبەر صلی الله علیـە و سـلم) نـەك ئیمانـداران، ئێمـە ڕێ و شـوێنمان بـۆ ئـەوان (واتـە ئیمانـداران) ڕوونکردۆتەوە بەرانبەر هاوسەران و کەنیزەکانیان (ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەوەیە کە:) هیچ دڵتەنگی و غەمبارییەك ڕووت تێ نەکات (وابزانی کە تۆ لە سنوور دەرچوویت بەوەی کە لە چوار هاوسەر زیاترت هەیە) هەمیشەو بـەردەوام خـوا لێخۆشـبوو و میهرەبانـە (بـۆ ئیمانداران).

١١-جویرەی کچی حارث: باوکی سەرکردەی بەنی مصطلق بوو بە دیل گیرا و بوو بە ئەسیری زەیدی کوری قەیس، کچە لە سەربەرزیەوە دابەزی بۆ شەرمەزاری،بۆیە چوو بۆلای پەیامبەر بۆ ئەوەی حاڵی خۆی لاباسبکات، بەڵکو پەیامبەر(ﷺ) بەزەیی پێدا بێتەوە و گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا مـن کچـی حـارثی کـوری ابـی ضـرار - سەرکردەی قەوم – م، و توشی بەڵایێك بووم کەتۆ خۆت پێی عالمی،هانام بۆتۆیە کـەوا لە کۆیلایەتی ڕزگارم بکەیت، چون کەسێکی وەکو من ناکرێـت مامەڵەی بەندە و کۆیلەی لەگەڵدا بکرێت،بۆیە پەیامبەری خودا(ﷺ) ئازادی کرد،جـا موسـڵمان بـوو، دواتـریش پەیامبەر فەرمانی ئازادکردنی دیل و کۆیلەکانی تری فەرموو،و هـاوەڵانیش دەیـانگوت

[٢٢] الأحزاب ٥٠

خەزوورانی پێغەمبەری خودان،لە کۆیلایەتی نایانهێڵینەوە، کە نزیکی سەد کۆیلە و بەندە دەبوون، بۆیە هاوسەرگیریەکەی خێر و بەرەکەت بوو بۆ هەموو قەومەکەی.

١٢-ماریای کچی شەمعونی قبتی: پاشا مقوقس(جریج ی کوری مینا) پادشاهی میسر،وەکو دیارێك پێشکەشی پێغەمبەری خودای کرد،باوکی یەکێك بوو لە گەورانی قیبت، سێیەمین کوری بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هێنایە دونیا بەنێوی ئیبراهیم،لێ هەر پێش دووساڵی وەفاتی فەرموو.

کاتێك کەوا ئیبراهیمی بۆ پەیامبەری خودا(ﷺ) هێنایە دونیا خێزانەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) ئیرەیان پێی دەبرد، ئیرەیەکەیان ئەوەندە توند بوو تا پەیامبەری خودا(ﷺ) ئازادی کرد و فەرمووی: (منداڵەکەی ئازادی کرد)[٢٣]

[٢٣] رواه ابن ماجه والدار قطني.

ينظر: سنن ابن ماجه، باب: أمهات الأولاد (٢٥١٦): ٢/٨٤١، سنن الدار قطني، كتاب: المكاتب (٤٢٣٣): ٥/٢٣١.

# بەشی دووەم / پابەندنەبوونی پەیامبەری خودا(ﷺ) بە سنوری مۆڵەتی ٤ خێزان

## دەروازە:

پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتدا سنوری نەبوو، تا ئاینی پیرۆزی ئیسلام هاتوو سنووری دانا بۆ هاوسەرگیری تا چوار ئافرەت، لەو کاتەشدا پێغەمبەر (ﷺ) نۆ یان دە خێزانی هەبوو، کەسیشی لەوان تەڵاق نەدا، هەروەها هیچ ئافرەتێکی تری نەهێنا پاش سنووردانان.، بۆچی پێغەمبەر (ﷺ)پێنج یان شەش خێزانە زیادەکانی تەڵاق نەدا؟ و ئایا قورئان پێغەمبەری (ﷺ) جیا کردۆتەوە لەم هاوسەرگیریانەدا؟وەڵامی ئەم دوو پرسیارە لە دووتوێی دوو لقدا وەڵام دەدەینەوە[٢٤].

## لقی یەکەم: تەڵاق نەدانی پەیامبەر(ﷺ) خێزانە زیادەکانی لە چوار:

پەیامبەر (ﷺ) هیچ خێزانێکی تەڵاق نەدا لەبەر چەند هۆکارێك:

١ -وەکو ئەوەی پێشتر زانیمان، لەڕووی ئینسانی وسیاسی وتەشریعی و فیقهی...هتد، دەبوو خێزانەکانی پەیامبەربمێننەوە،تاوەکوئەوەی پێغەمبەر(ﷺ)بونیاتی نابوو نەروخێت.

٢ -هەر ئافرەتێك کە هاوسەرەکەی تەڵاقی بدا بۆی هەیە جارێکی تر هاوسەرگیری بکاتەوە بە پیاوێکی تر، وەلێ گەر پەیامبەر (ﷺ) یەکێك لە خێزانەکانی تەڵاقدا بۆ هیچ پیاوێکی تر نابێ. چونکە خێزانەکانی پەیامبەر (ﷺ) دایکی ئیمانداڕانن، وەك لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:(النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ..)[٢٥]

واتە: ێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزیکترە بەئیمانداران لەخودی ؤیان(واتەدەبێت لەخۆیان زیاتر خۆشیان بوێت و فەرمانەکانی لەسەرو فەرمان و داخوازی خۆیانەوەبێت)

---

[٢٤] ينظر: القول المبين في سيرة سيد المرسلين: ص٤٠٢ – ٤٠٥، السيرة النبوية والدعوة في العهد المدني: ص١٤٥– ١٥٤، شبهات معاصرة حول الاسلام: ص٤٢–٤٥.

[٢٥] الاحزاب ٦

خێزانەکانیشی دایکیانن (دایکی ئیمانداارانن، دایکی مەعنەویانن).،کەوایە چۆن دەکرێت ئیماندارێك هاوسەرگیری لەگەڵ دایکی ئیمانداران بکات.

٣-خودای گەورە لە یەکێك لەو کەرامات و شکۆیەی کە بە پەیامبەر(ﷺ)ی بەخشیوە ئەوەیە کەس بۆی نییە هاوسەرگیری لەگەڵ خێزانەکانی ئەو بکەن لە دوای وەفاتی، ئەمەش قەدەغەکراوە هەر لە فەرمایشتی هەمان سورەتدا کاتێك کەوا باری تەعالا دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّـهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّـهِ عَظِيمًا)[٢٦]

واتە: هیچ کات بۆتان نیە ئازارو دڵتەنگی بۆ پێغەمبەری خوا پێش بێنن، هەرگز بۆتان نیە هاوسەرانی دوای خۆی بە هیچ جۆرێك مارە بکەن چونکە ئەو کارەتان لای خوا زۆر گەورەیەو (زۆر نابەجێیە، چونکە ئەوان دایکتانن، دایکیش لە ڕۆڵەی حەرامە)

وە ئەگەر پەروەردگار حەرامی کردبێت بۆ خێزانەکانی پەیامبەر (ﷺ) کە هاوسەرگیری بکەنەوە لە دوای ئەو ، چۆن پەیامبەری خودا (ﷺ) تەڵاقیان دەداو بێوەژنیان دەهێڵتەوە تا کۆتایی، و کە لە ئاینی ئیسلامدا هەموو ئافرەتێك بۆی هەیە هاوسەرگیری بکات پاش ئەوەی کە هاوسەرەکەی تەڵاقی دەدات؟

٤-لە مافی خێزانەکانی پەیامبەر(ﷺ) کە هەموویان دایکی ئیماندارانن کە بە درێژایی ژیانی پەیامبەر (ﷺ) ئەم جلە پیرۆز و کەریمە لەبەرکەن کە خودای گەورە بۆیانی ڕازاندۆتەوە لە جیاتی ئەو تەحریم کردنەی کە خودای گەورە دایناوە بۆئەوان و بۆ هیچ ئافرەتێکی تری دانەناوە کە ئەویش هاوسەرگیری نەکردنە دوای مردنی هاوسەرەکانیان.

٥-ئەم تایبەتمەندییە بۆ پەیامبەرە(ﷺ)و خودا حەڵالی کردووە لەپای ڕاکێشانی دڵی ئەو هۆز و قەومانەی کەوا بە پەیوەندیان لەرێگای نەسەبەوەیە، و تاوەکو پلە بەرزیو شەرەفی نزیکبوونەوە لە پێغەمبەر تەنها بۆ چەند بنەماڵەو هۆزێك نەبێ و لەنێو بازنەیێکی سنووردااردا نەبێ تا ئاینی ئیسلام لە نێو هەموو بنەماڵەو هۆزێك بڵاو بێتەوە کە لە ڕێگای خەزوورایەتی بە پەیامبەر(ﷺ)ەوە وابەستە دەبن.

---

[٢٦] الاحزاب ٥٣

## لقی دووەم: ئایا قورئان پەیامبەری خودای (ﷺ) جیا کردۆتەوە لەم هاوسەرگیرییانە؟

ئەگەر قورئان سنووری بۆ چوار ئافرەت دانابێت، بۆ خەڵکی ئاسایی، ئەویش ئەگەر یەکێکیان مرد یاخود تەڵاقیدا ئەوا دەتوانی یەکێکی تر بێنێ(ولا حرج على المستطيع إذا كان عادلا)

وەلێ پەیامبەر (ﷺ) خودا دە ئافرەتی پێبەخشیوە و پاشان هەموو ئافرەتێکی تری لێ حەرام کرد.خودای تەعالا دەفەرمووێت: لَّا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا[٢٧]

واتە: لەمەودوا هێنانی ئافرەتانی تر بۆ تۆ حەڵاڵ نیە، یان واز هێنان لە هەندێکیان، تا هاوسەرانی تر بخەیتە جێیان، هەرچەندە ئەو ئافرەتانەی دەتەوێ بیانخیتە جێگەی هاوسەرانت سەرسام بیت لە ڕێك و پێکییان جگە کەنیزەك، هەمیشە و بەردەوام خوا چاودێری هەموو شتێك دەکات. ئایا هەڵگرتنی خۆشەویستی بێوەژنانی بەساڵاچوو بە مەیزە و جیاکردنەوە دەژمێردرێت؟وە ئەگەر پەیامبەر(ﷺ) -حاشا- پیاوەکی دونیاوی بوویێ، ئەوا خۆی جیا دەکردەوەو ئافرەتی تری جوان و گەنجی بۆخۆی حەڵاڵ دەکرد....

وە دەگەڕێینەوەو بەو کەسانە دەڵێین کە بە پەیامبەر (ﷺ) دەڵێن ئەو کەسێکی ئارەزوومەندانە بووە: هێمن بن ئەی سەرلێشێواوانی ڕووڕەش.

کەسێکی ئارەزوومەندانە و شەهوانی ناتوانێ ئارام بگرێ لەسەر ژمارەکی دیاری کراو لە ئافرەتان، لەبەر ئەوەی کەسێکی ئارەزوومەندانە چێژ لەمە وەردەگرێ کە لە ئافرەتێکەوە بۆ ئافرەتێکی تر بڕوا کە هەفتەك یان مانگێك لەگەڵی بێ و، پاشان لە یەکێکی تر دەگەڕێ بۆ ئەوەی لەگەڵی بێت، ئەم شتانەش لە کەسێك دەبینرێ کە بەدوای ئارەزووەکانی دەکەوێت،کە هەندێ کەسیش دەبینین چوار ئافرەتی هەیە و ئارەزووی لە ئافرەتێکی ترە هەڵدەستێت خێزانی چوارەمی تەڵاق دەدات بۆ ئەوەی ئەو ئافرتە بێنێ کە ئارەزووی لێیە و ئەم شتەش

[٢٧] الاحزاب ٥٢

دووبارەدەبێتەوە هەر کاتێ ئارەزووی لێبێ و بەو جۆرەش دەتوانێ هاوسەرگیری لەگەڵ نـەوەت ئافرەت بکات نەك نۆ.

ئەگەر بچیتە چێشتخانەیێك و بتخەنە بـەردەم هەڵبـژاردنێك یەکـەمیان دەتـوانی نـۆ جـۆر خواردن لە یەك کاتدا هەڵبژێریت بەڵام ناتوانی بیانگۆڕیـت، تەنانـەت ئەگـەری کەمبوونیشـی هەیە.، دووەمیان دەتوانی خواردنی جیاواز هەڵبژێریت و بۆشت هەیە بیانگۆڕیت، بە دڵنیایەوە ئەوەی دووەمیان هەڵدەبژێریت..

# بەشی سێهەم / جیاوازی گەورەی نێوان تەمەنی پەیامبەر و تەمەنی حەزرەتی عائیشە(ﵞ)

دەروازە:

راستە کە پەیامبەری خودا (ﷺ) مرۆڤ بووە وەك هەموو خەڵکێکی تر لەرووی خەڵقەوە،لەگەڵ ئەوەشدا مرۆێکی ئاسایی نەبوو.،چون هیچ کەسێك وەصفی نەکردووە لە جوانیدا ئیلا بە مانگی شوبهاندووە،بۆنی عارەقەیشی لە بۆنی میسك و عەنبەر خۆشتر بوو، خاتوو عائیشە دەفەرمووێت:پەیامبەر(ﷺ)خودانی جوانترین رووخسار بووە لەنێو خەڵکدا.،و رۆشنترین رەنگی هەبووە،هیچ وەصفکارێك باسی نەکردووە ئیلا شوبهاندوویەتی بە مانگی ١٤ شەو، عارەقەی دەموچاوی وەکو لوئلوء وابووە.،بۆنەکەشی لە هەموو میسکێك خۆشتر بووە[٢٨].

سابیت لە ئەنەسی دەگێرێتەوە فەرموویەتی: بۆنی هیچ عەنبەر و میسکێك و شتێکی ترم نەکردووە خۆشتر لە بۆنی پەیامبەری خودا(ﷺ)خۆشتر.،و دەستم لەهیچ شتێك نەداوە نەئاوریشم و نەشتی تر نەرمتر لە لاشەی ئەو[٢٩]..

هەمیش لەلایەنی خولقیەوە زۆر زەحمەتە بەراوردکاری لەنێوان خۆرەوشتی ئەو کەسێکی تردا بکرێت، وەصفی پەروەردگاری خودانی میهر بەسە بۆ ئەو کە دەفەرموێ : وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ[٣٠]

واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت.

[٢٨] رواه: الدار قطني، والبيهقي، والحاكم، وابو نعيم واللفظ له.

ينظر: سنن الدار قطني، حديث(٢٩٧٦)، باب: كتاب البيوع: ٤٦٢/٣، السنن الكبرى، حديث(١١٠٩٦)، باب: جواز سلم الحال: ٣٤/١، المستدرك على الصحيحين، حديث(٤٢١٩)، باب: ذكر أخبار سيد المرسلين: ٦٦٨/٢، دلائل النبوة، حديث(٥٥٤)، باب: القول فيما اوتي يوسف عليه السلام : ٦٠٧/١.

[٢٩] رواه مسلم في المسند الصحيح المختصر.

ينظر: المسند الصحيح المختصر، حديث(٢٣٣٠)، باب: طيب رائحة النبي ﷺ: ١٨١٤/٤.

[٣٠] القلم ٤

چونکە ئەو تاکە مرۆڤ بووە کە خۆرەوشتی قورئانی پیرۆز بووە، وەك عائشە(ﷺ) دەفەرموێ (كان خلقه القران)[31] بۆیە خودای گەورە فەرمانی پێمان کردووە بۆ بەشوێنکەوتنی ئەو و دەفەرمووێ: قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّـهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّـهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّـهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ[32]

واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ئیمانداران) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

ئەو شتانەی کە باسمان کرد لەبارەی پەیامبەر(ﷺ) وای لێدەکا کە خۆشەویسترین کەسبێ لەلای خودا و لەلای خەڵکیش، بەو شێوەیەش ئیمانداران هەڵیدەبژێرن بەسەر خۆشییەکانی دونیا، وە لەزۆر کاتاندا هەیە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەری خودایان هەڵبژاردووە بەسەر خۆشییەکانی دونیا، وە گەورەترین مەوقیفیش دەبینین کاتێك خێزانەکانی پەیامبەر (ﷺ) سەرپشکی کردن لە نێوان هەڵبژاردنی دنیادا، و یاخود هەڵبژاردنی خوا و پێغەمبەرەکەی و ماڵی ئاخیرەت، هەموویان بە کۆدەنگیەوە دووەمیان هەڵبژارد.

پەروەرێنی حق تەعالا دەفەرموێت : يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا , وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّـهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّـهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا[33]

واتە: ئەی پێغەمبەر بەهاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دونیا و ڕازاوەیەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم، لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەست بەردارتان ببم. خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتان دەوێت، ئەوە دڵنیا بن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێ ئەندازەی

[31] عن الحسن قال: سألت عائشة عن خلق رسول الله ﷺ فقالت: كان خلقه القرآن.

قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح. وهذا اسناده فيه انقطاع، الحسن البصري إنما سمعه من سعد بن هشام.

ينظر: مسند احمد بن حنبل، حديث (٢٥٨٥٥): ٦/٢١٦

[32] ال عمران ٣١

[33] الاحزاب ٢٨ ــ ٢٩

ئامادەکردووە (پێغەمبەر هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقی کردەوە هەموانیان خواو پێغەمبەرو پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد).

باسی ئەم بابەتە لە دوو ڕووەوە و بە دوو لقی سەربەخۆ وەڵام ئەدەینەوە:

## لقی یەکەم : قوناغی هەرزەکاری لای کچان و بالغبوون و پێگەیشتنی

یەکەم/ بالغ بوون :- پرۆفیسۆر "شمیتز" – پسپۆری تەندروستی منداڵان دەڵێت:- روونە کەوا هەرزەکاری و گەورەبوونی قۆناغی هەیە، سەرەرای ئەوەی زەحمەتە بتوانرێت ئەو قۆناغانە دیاری بکرێت،وەلێ کۆمەڵە تەمەنی جۆراوجۆرم دیاری کردووە لە چوارچێوەی هەرزەکاری "١٢-١٨ / ١٢-٢٠ / ١٣- ١٩".[٣٤]

دکتۆر دلاوەر دەڵێت..:-سێ قۆناغی هەرزەکاری و گەورەبوون هەیە، و ئاشکرایە کەوا زیاد لە ٩٥٪ی حاڵەتەکان، بالغبوونی کچ لەتەمەنی ٨ساڵی تاوەکو ١٣ ساڵی دەستپێدەکات، پزیشکان بالغبوونی نێوان تەمەنی ٦-٨ ساڵی بە بالغبوونی زوو و پێشوەختە دادەنێن ،و گەر لەنێوان تەمەنی ١٣ و ١٤ ساڵیشدا هیچ نیشانەیکی بلوغی تێدا وەدەرنەکەوتبوو، ئەوا بالغبوونەکەی درەنگکەوتووە و بە بالغبوونی دواکەوتووو دادەنرێت[٣٥].

دەبێت ئێمە ئەوە بزانین کەوا پەیامبەری خودا(ﷺ) لە زەوییەکی گەرمدا پەروەردە بووە ئەویش نیمچەدوورگەی عەرەبیە، و زۆربەی ولاتە گەرمەکان بلوغ تێیدا زوو بەدەردەکەوێت، و هاوسەرگیریش بەهەمان شێوە زوو دەکرێت،خەڵکی نیمچە دوورگەی عەرەبیش تا سەردەمانی زووش هەر وابوون، لەگەڵ ئەوەی کەوا ئافرەتان جیاوازن لە رووی بونیە و پێگەیشتنی جەستەیی بۆ ئەم کارە و جیاوازییەکی گەورەی تێدایە،[٣٦] بەڵام گومان دروستکردن لەسەر هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوونێکی بچووك، ئاسایی بوو لەنێو ئەو ژینگە سەحراویەدا کە کچێك خێرا بالغ ببێت،ئاشکرایە کەوا ئەوە تەنها لای عەرەب نا بەڵکو لای فارس و رۆمیش بەهەمان شێوەیە، و گەر ئەمە شتێکی نائاسایی بوایە قورەیش – سەرسەخترین دوژمنەکانی – هێرشیان دەکردە سەر و باسی ئەو هاوسەرگیریەیان دەکرد..

---

[٣٤] لاروس موسوعة الآباء والأمهات، جاك شميتز ( أخصائي في طب الأطفال) ، أعد النص العربي الدكتور يوسف فرحان، سنة الطبع (١٩٩٩): ص٣٨٤.

[٣٥] شبهات معاصرة حول الاسلام: ص١٢.

[٣٦] السيرة النبوية في ضوء المصادر الأصلية: ص٧١١.

دووەم/ پێگەیشتن :- و گەر گوترا و پرسیارکرا چۆن پێغەمبەری خودا(ﷺ)لە رووی دەروونیەوە دەگەڵ خاتوو عائیشەدا گونجاوە لەکاتێکدا کە تەمەنی بچوك بوو و پێگەیشتوو نەبوو؟ زانا پۆرت چۆنیەتی بونیاتنانی کەسایەتی و قوناغەکانی کە پێیدا تێپەردەبێت بۆ ئەو بونیاتانە پێشنیاردەکات و شەش پێوەرمان بۆ دیاری دەکات دەربارەی بریاردان لەسەر کامڵبوونی کەسایەتی و پێگەیشتنی، پێورەکان ئەمانەن[37]:-

١-هەستکردن بە زاتی خۆی، و بەشداربوون لەمەجال و بواری جۆراوجۆر، چونکە تاك لەعانی گەشکردنی لە قۆناغی منداڵیەوە بەرەو هەرزەکاری و دواتریش پێگەیشتن فێردەبێت، بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لەسەر ئەزموونی بۆ هەڵوێست و مەوقیفی خۆی لە دەرەوەی سنورە بەرتەسکەکەی خۆی بۆ دروستکردنی هاورێیەتی نوێ،و گەیشتن بە ئەفکار و بیری نوێ و کاری نوێ و هتد..

٢-توانای تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی بە شێوەیێکی گەرم و گور، کەسایەتی پێگەیشتوو پێویستە لەسەری توانای وابەستەکردنی تاکی بە پەیوەندی جۆراوجۆری گەرم و گور لەگەڵ دەوروبەردا هەبێت،لە ژیانی خێزانی و لەگەڵ هاورێیان و هاوکاران و هتد..

٣-قبولکردنی زات و هەستکردنی بە ئاسایشی و ئارامی.،واتە تەندروستێکی چاك،و واتە کۆنترۆڵکردنی خۆی لە پەرچەکرداری زیادە لەکاتی رووبەروبوونەوەی کێشەدا..

٤-واقیعی بوونی دەرکپێکردن و بیرکردنەوە و تێفکرین و کارکردن بە شێوەیێکی واقیعیانە.

٥-بابەتی بوونی خود،و پەیپێبردنی کارەکان..

٦-ژیان لەگەڵ عەقیدە و فەلسەفەیێك کە ژیانی بۆ پریکاتەوە و ئامانجێکی بۆ دیاری بکات.

ئەوانەی باسمان کرد هەمووی لە کەسایەتی دایکمان عائیشەدا بەدی دەکرا، بۆ ئەمەش نمونەی وەڵامدانەوەی بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)و باوکی دایکی لەبارەی ئەو رووداوەی هەڵبەستراوەی لە گەرانەوە لە شەری بەنی مصتلقدا روویدا.،بەسە و کافیە کە لەساڵی ٥ی هیجریدا روویدا، کە دایکمان عائیشە(ﷺ)بوختانی زینای بۆ هەڵبەسترا و پەروەردگار بەری کرد و فەرمووی: (إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَّكُم بَلْ هُوَ

[37] علم النفس: ص٢٦٢- ٢٧٢. نقلا من كتاب شبهات معاصرة حول الاسلام بتصرف: ص١٣-١٥.

خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ)[38]

واتە:- بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان (یاخود وا خۆیان نیشان دەدا کە لە خۆتانن) وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕو خراپ بوو بۆتان، بەڵکو خێر بوو بۆتان (تا ئیمانداران لە دووڕووەکان جیا بێتەوە، ئیماندارانی دڵپاك وریا ببنەوە)، بێگومان تاوانی هەرکەس لەو بوختانچیانە لە گەردنی خۆیدایەتی، ئەو کەسەش سەرۆك و گەورەو هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت و گەورە بۆی ئامادەیە.

ئیدی ئەگەر لە ساڵی ٢ی کۆچی هاوسەرگیری کردبێت و ئەوکات تەمەنی ٩ ساڵان بووبێت،واتە لەکاتی کارەساتەکەدا تەمەنی ١٢ ساڵ بووە.!

تێبینی بکەن کەچی وەڵامی دانەوە :- سوێند بەخودا دەمزانی گوێتان لەمە بووە، تا ئەوەی جێگیر بوو لە دەروونتان بڕواتان پێی کرد، گەر بڵێم من بێتاوانم – کە خوداش پێی زانایە – بڕوام پێ ناکەن،وەلێ گەر دانم پێدانا بە باسەکە – کە خوداش ئاگادارە من بێتاوانم – باوەر دەکەن،سوێند بە پەروەردگار من هیچ نمونەێك بۆ خۆم و ئێوە شك نابەم تەنها وەکو ئەوەی باوکی یوسف فەرمووی: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ)[39]

واتە: چارم تەنها خۆگری و ئارام گرتنە بەجوانترین شێوە، هەر خواش داوای کۆمەکی لێدەکرێت لەسەر ئەو باسەی ئێوە دەیکەن.

و دواتریش چوو پاڵکەوت لەسەر جێگایەکەیدا. ئێستاش با گوێبگرین کە چی گوت لەدوای دابەزینی ئایەتی بێ بەریبوونی کاتێ پەیامبەر(ﷺ)فەرمووی: (موژدەبێت عائیشە، خودا بێتاوانی سەلماندی،) و دایکی پێی گوت : هەستەوە بۆی، واتە سوپاسی بکە،وەلێ عائیشە فەرمووی: (نا سوێند بە خودا هەڵناسمەوە و سوپاسی کەس ناکەم خودا نەبێت، چون ئەو بێ بەری بوونی من دابەزاند)[40]..

---

[38] النور ١١

[39] يوسف ١٨

[40] روى البخاري ومسلم – واللفظ للبخاري – عن عائشة رضي الله عنها، قالت: لما ذكر من شاني الذي ذكر، وما علمت به قام رسول الله صلى الله عليه وسلم في خطيبا، فتشهد فحمد الله وأثنى عليه بما هو أهله، ثم قال: «أما بعد أشيروا علي في أناس أبنوا أهلي، وايم الله ما علمت على أهلي من سوء، وأبنوهم بمن والله ما علمت عليه من سوء قط، ولا يدخل بيتي قط إلا وأنا حاضر، ولا غبت في سفر إلا غاب معي»، فقام سعد بن معاذ فقال: ائذن لي يا رسول الله أن نضرب أعناقهم. وقام رجل من بني الخزرج، وكانت أم حسان بن ثابت من رهط ذلك الرجل، فقال: كذبت أما والله أن لو كانوا من الأوس ما أحببت أن تضرب أعناقهم. حتى كاد أن يكون بين الأوس والخزرج شر في المسجد، وما علمت فلما كان مساء ذلك اليوم، خرجت لبعض حاجتي، ومعي أم مسطح فعثرت، وقالت: تعس مسطح، فقلت:

## لقی دووەم : ئەمەنی راستەقینەی خاتوو عائیشە کاتێك پەیامبەر(ﷺ)هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد

دەروازە :

ئەمە لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ عائیشەدا، بە وەحی فەرمانی پێکرا..

خاتوو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (سێ شەو تۆم لە خەودا بینیوە،تۆیان لە پارچەیێك ئاوریشمدا بۆ هێنام و گوتیان: ئەمە خێزانی تۆیە کاتێك کە پارچە قوماشەکەم لابرد بینیم تۆی و گوتم: گەر ئەمە لە خوداوە بێت روودەدات)[41]،

ئایا لێکدانەوەی ئەو خەونە هەر بەزاهیری وەردەگیرێ، یاخود مانای شاراوەتری هەیە، حافز لە (فتح الباری) دا دەڵێت لە باسەکەدا جیاوازی ڕا لەنێوان زانایان هەیە..[42]

---

اي أم تسبين ابنك؟ وسكتت ثم عثرت الثانية، فقالت: تعس مسطح، فقلت لها: أي أم أتسبين ابنك؟ فسكتت ثم عثرت الثالثة، فقالت: تعس مسطح فانتهرتها، فقالت: والله ما أسبه إلا فيك، فقلت في أي شاني؟ قالت: فبقرت لي الحديث، فقلت: وقد كان هذا، قالت: نعم، والله فرجعت إلى بيتي كأن الذي خرجت له لا أجد منه قليلا ولا كثيرا، ووعكت، فقلت لرسول الله صلى الله عليه وسلم: أرسلني إلى بيت أبي، فأرسل معي الغلام فدخلت الدار، فوجدت أم رومان في السفل، وأبا بكر فوق البيت يقرأ، فقالت أمي: ما جاء بك يا بنية؟ فأخبرتها وذكرت لها الحديث، وإذا هو لم يبلغ منها مثل ما بلغ مني، فقالت: يا بنية، خففي عليك الشان فإنه والله لقلما كانت امرأة حسناء عند رجل يحبها لها ضرائر إلا حسدنها، وقيل فيها: وإذا هو لم يبلغ منها ما بلغ مني، قلت: وقد علم به أبي؟ قالت: نعم، قلت: ورسول الله صلى الله عليه وسلم قالت: نعم، ورسول الله صلى الله عليه وسلم واستعبرت وبكيت، فسمع أبو بكر صوتي، وهو فوق البيت يقرأ، فنزل فقال لأمي: ما شانها؟ قالت: بلغها الذي ذكر من شانها، ففاضت عيناه، قال: أقسمت عليك أي بنية إلا رجعت إلى بيتك فرجعت، ولقد جاء رسول الله صلى الله عليه وسلم بيتي فسأل عني خادمتي، فقالت: لا والله ما علمت عليها عيبا إلا أنها كانت ترقد حتى تدخل الشاة، فتأكل خميرها – أو عجينها – وانتهرها بعض أصحابه، فقال: اصدقي رسول الله صلى الله عليه وسلم حتى أسقطوا لها به، فقالت: سبحان الله والله ما علمت عليها إلا ما يعلم الصائغ على تبر الذهب الأحمر، وبلغ الأمر إلى ذلك الرجل الذي قيل له، فقال: سبحان الله والله ما كشفت كنف أنثى قط، قالت عائشة: فقتل شهيدا في سبيل الله، قالت: وأصبح أبواي عندي، فلم يزالا حتى دخل علي رسول الله صلى الله عليه وسلم، وقد صلى العصر، ثم دخل وقد اكتنفني أبواي عن يميني وعن شمالي، فحمد الله وأثنى عليه ثم قال: «أما بعد، يا عائشة إن كنت قارفت سوءا أو ظلمت فتوبي إلى الله، فإن الله يقبل التوبة من عباده» قالت: وقد جاءت امرأة من الأنصار فهي جالسة بالباب، فقلت: ألا تستحي من هذه المرأة، أن تذكر شيئا، فوعظ رسول الله صلى الله عليه وسلم فالتفت إلى أبي، فقلت له: أجبه، قال: فماذا أقول؟ فالتفت إلى أمي، فقلت: أجيبيه، فقالت: أقول ماذا؟ فلما لم يجيباه تشهدت فحمدت الله وأثنيت عليه، بما هو أهله، ثم قلت: أما بعد فوالله لئن قلت لكم إني لم أفعل، والله عز وجل يشهد إني لصادقة، ما ذاك بنافعي عندكم، لقد تكلمتم به وأشربته قلوبكم، وإن قلت إني قد فعلت، والله يعلم أني لم أفعل لتقولن قد باءت به على نفسها، وإني والله ما أجد لي ولكم مثلا، والتمست اسم يعقوب فلم أقدر عليه إلا أبا يوسف حين قال: {فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ} يوسف: ١٨، وأنزل على رسول الله صلى الله عليه وسلم من ساعته فسكتنا فرفع عنه، وإني لأتبين السرور في وجهه، وهو يمسح جبينه، ويقول: «أبشري يا عائشة، فقد أنزل الله براءتك»، قالت: وكنت أشد ما كنت غضبا، فقال لي أبواي: قومي إليه، فقلت: لا والله لا أقوم إليه، ولا أحمده ولا أحمدكما، ولكن أحمد الله الذي أنزل براءتي، لقد سمعتموه فما أنكرتموه ولا غيرتموه...

ينظر: صحيح البخاري، باب: ان الذين يحبون ان تشيع الفاحشة، حديث (٤٧٥٧): ١٠٧/٦، صحيح مسلم، باب: في حيث الإفك وقبول توبة القاذف، حديث (٢٧٧٠): ٢١٢٩/٤.

[41] سبق تخريجه.

باسی ئەم بابەتە دەکەین هەم لە ڕووانگەی عەقلی هەمیش نەقلی، بۆ ئەوەی بگەین بە حەقیقەت، کەوا عائیشە ٩ ساڵان نەبووە – وەکو ئەوەی دەگوترێت – کاتێك کە پەیامبەر(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد.

**یەکەم/ عەقڵ**

توێژەر"ئەحمەد محمد جمال"[43] بەنەقڵ لە کتێبی(اباطيل يجب ان تمحي من التاريخ)ی دکتۆر ئیبراهیم **شموطرا**،دەڵێت :

پێویستە هەرلێکۆڵەرێك و توێژەرێك و خوێنەرێك لەباسی هاوسەرگیری پەیامبەر(ﷺ)بە عائیشە ئەم شتانە بزانێت:-

١-لەو کتێبانەی سیرە(ژیانامەی پەیامبەر)کە باسی ئەوە دەکات عائیشە لەو تەمەنە بچوکەدا بووە،لە پاڵیدا باسی شتێکی تریش دەکات کە هەموو ڕاویان(گێڕاوەکانی سیرە)لەسەری کۆکن ئەویش ئەوەیە کەوا خاتوو عائیشە پێش ئەوەی بۆ پەیامبەر(ﷺ) دەستنیشان بکرێت، بۆ پیاوێکی تر بەنێوی"جبیری کوری **مطعم**"نیشانە کرابوو،کە ئەویش لەسەر بێباوەری مایەوە تاوەکو ساڵی ١٠ی هیجری، دەی کەوایە کەی **مطعمی** باوکی جبیر بۆ کورەکەی نیشان کردووە..؟[44]

مەعقول نیە کە نیشانەی کردبێت و بێ باوەربووبێت، و ئەبوبەکر و کەس و کاریشی موسڵمان بووبن! چون سراع و ناکۆکیێکی توند لەنێوان بێ باوەران و موسڵمانان هەبوو، بۆیە غالیبا دەبێت ئەم نیشانکردنە پێش گەیشتنی پەیامی خودا بە ڕەسول(ﷺ)لە مەککەوە بووبێت، ئیدی کەوایە ئەگەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەساڵی دووەمی کۆچی هاوسەرگیری لەگەڵدا کردبێ ئەوا کەواتە دەبێت تەمەنی خاتوو عائیشە ئەوکاتە ١٤ساڵی تێپەراندبێت، گەر واش بێت کەوایە باوکی جبیر داخوازی عائیشەی لەرۆژی لەدایکبوونیدا کردووە بۆ کورەکەی جبیر.، ئەوەش بە هەموو شێوەیێك نەگونجاوە و ناکرێت داخوازی و نیشانی کچێك لەرۆژی لەدایکبوونیدا بکرێت!

---

[42] ينظر: فتح الباري: ١٨١/٩.

[43] ينظر: موقع الداعية الدكتور محمود عكام.

[44] ينظر: الاصابة في تمييز الصحابة: ٥٧٠/١، صفة الصفوة: ص٢٨٦.

٢-خولەی کچی حەکیم خێزانی عوسمانی کوری مەزعون، کە هەمیشە لە خەمی پەیامبەردا بوو، لە دوای وەفاتی خاتوو خەدیجەوە چوو بۆلای پەیامبەر و پێشنیاری هاوسەرگیری بۆکرد بۆ ئەوەی لەم خەم و پەژارەیە و تەنیایەی کە تێی کەوتووە رزگاری ببێت، کاتێ کە پەیامبەر(ﷺ) لێی پرسی کێت پێ باشە ئەی خەولە لە وەڵامدا گوتی: گەر سەڵتت دەوێت عائیشەی کچی ئەبوبەکر و گەریش بێوەژنت دەوێت سودەی کچی زمعە[٤٥].

بۆیە خەولە پێشنیاری سەودەی بێوەژن و عائیشەی سەڵتی کرد بۆ پەیامبەر(ﷺ)،چونکە دەیزانی هەردووکیان شیاون بۆ ئەوەی ببنە خێزانی پەیامبەر(ﷺ) و جێگای خاتوو خەدیجە(رضي الله عنها)پڕبکەنەوە، ئایا مەعقولە کە خەولە پێشنیاری کچێکی شەش ساڵان بکات بۆ ئەوەی جێگای خەدیجە پڕبکاتەوە.؟پێویستە بشزانرێت کەوا پەیامبەر (ﷺ)سودەی هەڵبژارد و دوای پاش چوار ساڵان هاوسەرگیری لەگەڵ عائیشەدا کرد(رضي الله عنها).

٣- خاتوو أم رمان(دایکی عائیشە) زۆر دڵخۆش بوو کاتێك نیشانی کچەکەی بۆ جبیری کوری متعم هەڵوەشایەوە و پەیامبەر داخوازی و نیشانی کرد، تەنانەت بە ئەبوبەکری فەرموو: ئەم کچەی تۆ عائیشە خودا جبیر و ئەهلی جبیری لەسەر ڕێگاکەیدا لادا و پەیامبەری خودا(ﷺ)ی بەخێر و بەرەکەتەوە هێنایە ڕێگای[٤٦].، و دایك کاتێك کچەکەی بەشوودەدات شارەزاترین کەسە لە نیشانەکانی پێگەیشتن لە کچەکەیدا،کەواتە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عائیشە کاتی هاوسەرگیری دووبارەی هاتووە بۆیە دایکی زێد دڵخۆش بووە..

دکتۆر دلاوەر دەڵێت: بە ژمێریارییەکی سادە گەر وامان دانا کەوا تەمەنی خاتوو عائیشە پێش دابەزینی پەیام بۆ موستەفا(ﷺ) ٢ ساڵ بووە و نیشان کراوە بۆ جبیری کوری متعم هەر لە لەدایکبوونییەوە ئیدی کەوایە ئەوکاتەی پەیامبەر هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد لە مەدینە: ٢+١٣+٢=١٧ ساڵ بووە! وەلێ ئەوەی مەعقولە و دەزانرێت کەوا بچوکترین تەمەنی نیشانکردن بۆ کچ دە ساڵانە و هاوسەرگیری لەگەڵکردنیەتی لە ١٢ ساڵان یاخود ١٣ ساڵان و هتد..،ئیدی کەوایە دەبێت ئەو کاتەی پەیامبەر(ﷺ) لە مەدینەدا هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد تەمەنی: ١٠+١٣+٢=٢٥ ساڵ بووە![٤٧]

---

[٤٥] ينظر: مسند أحمد، مسند الصديقة عائشة، حديث (٢٥٧٦٩): ٥٠١/٤٢، المستدرك على الصحيحين ، كتاب النكاح، حديث (٢٧٠٤): ١٨١/٢، المعجم الكبير، عائشة بنت أبي بكر، حديث (٥): ٢٢/٢٣، دلائل النبوة، باب: تزوج النبي ﷺ : ٤١١/٢– ٤١٢.

[٤٦] ينظر: المراجع السابقة.

[٤٧] شبهات معاصرة حول الاسلام: ص٣١.

و ئەوەی کەوا پاڵپشت و بەهێزکەری قسەکانە کە کردمان ئەوەیە کە طبري لە کتێبەکەیدا دەفەرمووێت:-هەر چوار منداڵەکەی ئەبی بەکری صدیق ﷺ لەپێش ئیسلام لەدایکبوونە[٤٨]..، ئیدی بۆیە دەبێت خاتوو عائیشە پێش هاتنی ئیسلام لەدایکبووبێت.

٤-دکتۆر محمد صادق البنداق دەڵێت:-عەرەب مێژووی حیسابی نەزانیوە وەکو ئەوەی ئەم سەردەمە، بەڵکو مێژووی خۆیان بە ڕووداوەکان بە ڕووداوگەلێکی وەکو بونیاتنانی کەعبەی شەریف و ڕووخانی بەندوای یەمەن و مردنی کەعبی کوری لوئەی(باپیرەی حەوتەمی ڕەسول(ﷺ))و ڕووداوی فیل و ڕۆژی جەنگی ئەوس و خەزرەج هتد.. تۆمار دەکرد[٤٩]..

و دکتۆر دلاوەر دەڵێت:-پێش زیاتر لە هەزار و چوارسەد و سی ساڵ هیچ تۆماری لەدایکبوونێك بوونی نەبووە،بۆیە بێ گومان دەکرێت هەڵە ڕوویدابێت لەو فەترەی کە تایبەتە بە مێژووی تەمەن دیاری کردن و شتی دیکە،..

ڕێگەم پێبدە خوێنەری ئازیز بۆ پیشاندانی ئەو تۆمارانەی لە دایکبوون لە چلەکانی سەدەی رابردوو لە عیراق بۆ ئەوەی باوەری تەواوت بۆ دروست بێت بەوەی کەوا ئاماژەمانپێدا، لە تۆمارەکاندا زیاد لە ٤٠٪ی تۆمارەکان هەڵەبوون، چون ئاشکرابوو کە فەرمانگەکانی تۆمار، تۆماری زۆربەی عێراقیەکانی بەیەکی تەمووز(مانگی حەوت) دەنوسی.،بۆ نمونە گەر تەنانەت منداڵێك لەپێش سێ ساڵ لەدایکبووبێت و باوکی دوای سێ ساڵان سەردانی فەرمانگەی تۆماری کردبا، لەدایکبوونی منداڵەکە بەو ساڵە تۆمار دەکرا واتە —ساڵی سەردانی کردنی فەرمانگەکە، و لە تۆمارەکەشدا بە یەکی تەموز دەنوسرا، سەرەرای ئەوەی ئەوان مانگ و ڕۆژەکەشیان هەر فەرامۆش دەکرد[٥٠].

٥-عباس مەحمود عقاد ڕیوایەتی تەمەنی خاتوو عائیشە بەهەڵە دادەنێت، و لە میانەی ستایشکردنی دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشەدا دەڵێت: خاتوو عائیشە هەمیشە شانازی بە بچوکی تەمەنی خۆی دەکرد لەنێو خێزانەکانی تری پەیامبەردا(ﷺ)، گەر باسی تەمەن کرابا زۆر لای خۆش بوو کە بڵێت:- من کچێکی تەمەن بچوك بووم.، و هەمیشە یەکێك لە عوزر و بیانوەکانی ئەوە بوو کەوا یان شتێکی نەزانیوە یاخود تەمەنی بچووك بووە، ئەوەشی هەمیشە

---

[٤٨] تاريخ الأمم والممالیك: ٤/٥٠.
[٤٩] التربية الاسلامية، عدد ٣، السنة ٥٢.
[٥٠] شبهات معاصرة حول الاسلام: ص٣٣-٣٤

پێی خۆشتر بووە کە کامە ریوایەت بچوکترین تەمەنی بووایە ئەوی هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی خۆی هەڵبکێشێت و ناز بەسەر رەفیقانیەوە بکات.!

ڕای جیاواز هەیە لەسەر تەمەنی خاتوو عائیشە کاتێك کە لە ساڵی دووهەمی کۆچیدا زەماوەندی لەگەڵ پەیامبەر(ﷺ) دا کرد، هەندێکیان دەڵێن ٩ ساڵ بووە و هەندێك دەڵێن زیاتر بەچەند ساڵێك،ئەم ئیختیلاف و را جیاوازانەش هیچ جێگای سەرسورمان نیە لەنێو قەوم و میللەتێك کە رانەهاتووە لەسەر تۆمارکردنی بەرواری لەدایکبوون، ئیدی هیچ پیاوێك یاخود ئافرەتێك لەو سەردەمەدا نەبووە کە دوو یان سێ مێژووی لەدایکبوونی یاخود مێژووی هاوسەرگیری یان وەفاتی نەبووبێت، واتە جاری وایە ئیختیلاف و جیاوازی ڕا لەنێوان زانایان لەبارەی مێژووی لەدایکبوونی ناوداران دەگاتە رادەیێك کە ١٠ ساڵ جیاوازی نێوانیان دروست دەبێت،چجای ئەوانەی خودانی شوهرەت و ناو و ناوبانگن ! عائیشە دەڵێت:- کە ئەو لە دەوروبەری خۆیدا گوێی لە خەملاندنی تەمەنی دەبوو و لە هیچ دەستنوسێکدا نەبوو، ئەویش حەزی دەکرد لەو خەملاندنانە بچوکترینیان هەڵبژێرێت[٥١]..

٦-هەموو سەرچاوە مێژوویەکان دەڵێن کەوا (ئەسماء) بە ١٠ ساڵان لە عائیشە گەورەتر بووە، و ئەسماء بە ٢٧ساڵان پێش هیجرەت لەدایکبووە،کەواتە تەمەنی لەسەرویەندی گەیشتنی پەیامی خودا لەساڵی ٦١٠ی زاینی،١٤ساڵان بووە[٥٢].، کەوایە تەمەنی عائیشە پێش گەیشتنی پەیامی خودا ٤ ساڵان بووە،کەواتە کاتێك پەیامبەر(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵ عائیشەدا کردووە تەمەنی :- ٤+١٣+٢ =١٩ ساڵ بووە.

دووەم /نەقڵ

بەشێك لە گێراوانی فەرموودە، ئەو فەرموودانەی باسی تەمەنی دایکمان عائیشە دەکات بەلاوازیان لەقەڵەم داوە – کە ئەوەش راست و پەسەندە – چون بە ٥ شێوە هاتووە کە هەر پێنجیان هیشامی کوری عەروە گێراویەتیەوە – کە زۆرێك بەلاواز لێی دەروانن، بەتایبەتی دوای هاتنی بۆ عێراق و بەساڵاچوونی و تێکەڵکردنی حەدیس کە لەدوایدا باسی دەکەین..فەرموون بۆ حەدیسەکان..:-

---

[٥١] الصديقة بنت الصديق: ص٣٨ و ص٥٩– ٦٠.

[٥٢] ينظر: سير أعلام النبلاء، باب: اسماء بنت ابي بكر: ٥٢٠/٣، البداية والنهاية، باب: اسماء بنت ابي بكر الصديق: ٣٨١/٨، تقريب التهذيب، باب: اسماء بنت ابي بكر: ص٧٤٣.

١-صەحیحی بوخاری[٥٣]:-

ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسە لەچەند کەسێك دەگێڕێتەوە تا دەگات بـە هیشـامی کـوری عەروە،کە ئەویش لە عائیشەی دەگێڕێـتەوە.،کە عائیشە دەڵێـت: پەیامبـەر لـە تەمـەنی ٦ ساڵاندا مارەی کردم لەدوای ئەوەی هاتینە مەدینە دابەزین لە ماڵی حارسی کوری خەزرەج،من لەوێ نەخۆش کەوتم، دواتر أم رمانی دایکم هاتە لام منیش لەدەرەوە لەسەر جۆلانێـدا لەگـەڵ رەفیقەکانم بووم،بانگی کردم و منیش نەمزانی لەبەرچی بانگم دەکات دەستی گرتم و تابەردەرگا بردمی،منیش ترس دڵەراوکێم بوو ئەویش هەندێك ئاوی بە دەموچاوم داکرد و ئینجا منی بردە ژوورەوە کۆمەڵێ لە ئافرەتە ئەنصاریەکان لەژوورەوە بوون و گوتیان لەسەر خێـر و بەرەکـەت و خێرانداربێت.،جا تەسلیمی ئەوانی کردم منیان رازاندەوە بەڵام کەسیان ریعایەتیان نەکردم تەنێ پەیامبەر نەبێـت کاتێ منیان تەسلیم بەو کرد و ئەوکات من کچێکی ٩ ساڵان بووم.

٢-صەحیحی موسلیم[٥٤]:-

ئیمامی موسلیم ئەم حەدیسە لە یەحیای کوڕی یەحیا دەگێڕێتەوە کـە یـەحیا دەڵێـت لـە باوکی معاویە لە هیشامی کوری عەروەوە بۆی گێڕاوینەوە، و چەند کەسێکی تریش بەهـەمان شێوە گوێیان لێبووە و لە عائیشەوە دەگێرنەوە:-پەیامبەر(ﷺ) لە شەش ساڵیدا مارەی کردم و لە نۆ ساڵیدا گواستمیەوە.

٣-مصنفی کوری أبی شیبە[٥٥]:-

عبدەی کوری سلیمان لە هشامەوە کە ئەویش لە باوکیـەوە بـۆی گێراینـەوە کـە عائیشـە فەرموویەتی: پەیامبەر
(ﷺ)لەشەش ساڵیدا مارەی کردم و لە ٩ ساڵیدا گواستمیەوە.

٤-السننی گەورەی نسائی[٥٦]:-

محمدی کوڕی ئادەم پێی گوتین کەوا عبدەی هشام لە باوکیەوە کە ئەویش لە باوکیەوە بـۆی گێراینەوە کە عائیشە فەرموویەتی:-پەیامبەر(ﷺ) لە شەش ساڵیدا مـارەی کـردم و لـە نـۆ ساڵیدا گواستمیەوە و خەریکی یاریکردن بووم.

---

[٥٣] ینظر: صحیح البخاري، حدیث (٣٦٠٥): ٢٨٢/١٢.

[٥٤] ینظر: صحیح مسلم، حدیث (١٤٢٢): ١٠٣٩/٢ .

[٥٥] ینظر: الکتاب المصنف في الأحادیث والآثار، حدیث (٣٣٩٢٧): ١٨/٧.

[٥٦] ینظر: المجتبی من السنن (السنن الصغری للنسائي)، حدیث (٣٣٧٨):١٣١/٦.

٥-اللعل[٥٧]:-

باوکم بۆی گێرامەوە و گوتی حەسەنی کوڕی موسا لە حەمادی کوڕی سەلەمەوە ئەویش لە هیشامی کوڕی عەروەوە ئەویش لەباوکیەوە بۆی گێراینەوە کەوا عائیشە گوتویەتی: پەیامبەر(ﷺ) دوای وەفاتی خەدیجە و پێش هیجرەتی بۆ مەدینە بە دوو یا سێ ساڵان کە ئەوکات من شەش یا حەوت ساڵ دەبووم،مارەی کردم،کاتێك کە چووینە مەدینە کۆمەڵە ئافرەتێك هاتنە لام کاتێ کە یاریم بە جۆلانێ دەکرد،و ئامادەیان کرد و دواتر پەیامبەر منی گواستەوە کاتێ کە ٩ ساڵان دەبووم.

گەر سەرنج بدەین لەهەموو ئەو ریوایاتانەی باسمان کرد هەموو دەگەرێتەوە بۆ عەروە کە ئەویش بەتەنیا حەدیسی لەوشێوەی لە عائیشەی دایکی ئیمانداراندا وەرگرتووە،و هەروەها بەتەنیا هیشام لەباوکی وەرگرتووە،کێشەکەش لێرەدا لە هشامدایە..

ابن رجب لە شەرحی عللی ترمزی، و زرقانی لە شەرحی بۆ **موطا**، رای زۆر لە موحەدسین وایە کە هشامی کوری عەروە لەدوای هاتنی بۆ عێراق لاوازبووە،رای موحەدیسین پوختدەکەینەوە بەم شێوەیە:-

(عبدالرحمانی کوری یوسفی خراش دەڵێت:مالیك لە هیشام رازی نەبوو،هیشام راستگۆ بوو خەبەری راستگۆیەکەیشی لە کتێوە راستەکاندا هەیە،و گەیشتووە بەمن کە ئیمامی مالیك حەدیسی هیشامی بەپەسند نەدەزانی بۆ ئەهلی عیراق، هیشام ٣ جار هات بۆ کوفە جاری یەکەم دەیگوت باوکم قسەی بۆ کردوومە و گوتی گوێم لە عائیشە بووە، لە سەردانی دوومەدا دەیگوت باوکم خەبەری پێدام لە عائیشە، لەسەردانی سێیەمدا دەیگوت لە باوکم لە عائیشە، واتە باسی بیستنی نەدەکرد لە عائیشەوە) و ئەوەش پشتیوانی لەو قسەیەی ئیمامی ئەحمەد دەکات کە دەڵێت حەدیسی ئەهلی مەدینە وەکو ئیمامی مالیك و غەیری لە کە لە هیشامیان وەرگرتووە راستترە لە حەدیسی ئەهلی عیراق کە لەویانەوە وەرگرتووە.

و العقلي بە سەنەدی خۆیەوە دەگێرێتەوە لە ابن لهیعە کە دەڵێت(أبو اسود خۆی وەدوردەخستەوە لە حەدیسی هیشامی کوری عەروە کە لەباوکیەوە دەگێرایەوە،تەنانەت جاری وابووە یەك ساڵیش دەربارەی حەدیس قسەی لەگەڵدا نەکردووە)

---

[٥٧] ينظر: العلل ومعرفة الرجال ، حديث (٥٠٧٣): ٣/٢٤٣.

و ابن هیعەوە لە ابی أسود دەگێڕێتەوە و دەڵێت(عورە حەدیسی ئەوم زەرعی پێکەوە نەدەبەستاوە تا بگات بە پەیامبەر، و بەڵکو دەیپچراند)

کوری ابی خەیسەمە لە یەحیای کوری معینەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی(حەدیسی مەعمەر لە هیشامی کوری عەروە جۆراوجۆرە و وەهم و خەیاڵاتی لەنێودایە)

قازی ئیسماعیلی مالیکی دەڵێت(خەبەرم لە عەلی کوری مەدینیەوە پێگەیشت کە یەحیای کوری قەتان هەندێك شتی بەلاواز دەزانی کە هیشامی کوری عەروە باسی کردبێت لە کۆتایەکانی تەمەنیدا بەهۆی خراپبوونی حیفز و ئەزبەری.،دوای ئەوەی کە بەساڵاچوو.، خوداش زاناترە.،هەروەها گوێم لە قسەی عەلی کوری نەصر و غەیری ئەو بووە باسی قسەیێکی لەو شێوازەدەکەن کە یەحیای کوری سەعید دەگێڕێتەوە)[٥٨]

و ابن حجر لە فەتح الباریدا دەڵێت(هیشامی کوری عەروەی کوری زبێری کوری عەوامی قورەیشی ئەسەدی لە تابیعە بچوکەکان بووە.،کۆدەنگی لەسەر دامەزراوی لەرووی لەبەرکردنەوە هەبووە،وەلێ کاتێ بەساڵادەچێت حیفز و لەبەرکردنی دەگۆڕێت.،لەبەر ئەوە گۆرانکاری بە حەدیسی ئەو هاتووە لە هاتنی سێیەمی بۆ عێراق، یەعقوبی کوری شیبە گوتی : هیشام متمانەپێکراوە هیچ شتێك لەبارەی ئەوەوە باس نەکراوە.،لێ لەدوای نیشتەجێ بوونی لەعێراق حەدیس گێڕانەوەی لە باوکی تێکەڵ دەکرد.،لەبەر ئەوە خەڵکی شارەکەی رەخنەیان لێگرت،ئەوەی ئێمە دەیبینین،ئەو حەدیسی لەباوکی نەدەگێڕایەوە تەنها مەگەر گوێی لەباوکی بوویێت.،لە بێ مویالاتی و کەمتەرخەمی ئەو هەندێك جار باسی باوکی نەدەکرد لەکاتی گێڕانەوەی حەدیسدا،تەنانەت هەندێك جار حەدیسی دەدایە پاڵ باوکی کە لە غەیری باوکی وەریگرتبوو.،منیش دەڵێم ئەوەش خودی (التدلیس)ە لە حەدیسدا.، لەبارەی قسەکەی کوری خەراش کە دەڵێت مالیك لێی رازی نەبوو.، دەگێڕنەوە لە ئیمامی مالیك دەربارەی عەروە شت لەوەش خراپتر روویداوە.،ئەمەش بەپێی قسەی یەعقوبی.،

ئەبو حاتەم دەڵێت:-هیشام راستگۆیە بەڵام کە گەورەبوو حیفز و لەبەرکردنی گۆڕانی بەسەردا هات و هەرشتێکیان پێ دابووایە دەیخوێندەوە و هەرشتێکیشان پێ رابگەیاندایە وەری دەگرت.،پێشتر حەدیسەکانی راستر بوو و ریوایەتەکانی دەخوێنرانەوە لە کتێبەکاندا.،هەروەها ئیبن وارە و غەیری ئەو کرداری پارەوەرگتنی بەرامبەر بە حەدیس بەباشیان نەزانیوە،

---

[٥٨] ینظر: شرح علل الترمذي: ١/٢٥٣، شرح الزرقاني على موطا الامام مالك: ١/٩٣.

فەرهیانی دەڵێت پێم گوت: گەر حەدیست لەبەرە باسی بکە بۆ خەڵك.،وەلیّ گەر لەبەرت نیە باسی مەکە، ئەویش لەوەڵامدا دەیگوت:من ئەو حەدیسانەم بە دورست وەرگرتووە و خوداش دەفەرمووێ :- ئەوەی کەوا گۆڕانکاری بەسەر وتەێك دێنێت کە گوێی لێبووە تاوانەکە لە ئەستۆی خۆیەتی.،من دەڵێم بوخاری لەنێو کتێوە صەحیەکەی خۆی جگە لە ٢ حەدیس نەبێت چی تری لێ ریوایەت نەکردووە)[٥٩]

روونتر و سادەتر دەگەین بەوەی کەوا(هشامی کوری عەروە)لە مەدینەی مونەوەرەدا راستگۆ و باوەڕپێکراو بووە، وەلیّ کاتێك دەچێتە عێراق حیفز و ئەزبەرکردنی بۆ حەدیس لاواز دەبوو، و دەستی کرد بەدانەپاڵی قسەی کەسی تر بۆ کەسی تر، و دواتر دەستی کرد بە گوتنی لە باوکمەوە،لە جیاتی ئەوەی بڵێت گوێم لێبوو یاخود پێی گوتم،و لە زانستی فەرموودەدا وشەی (گوێم لێبوو یاخود پێی گوتم)بەهێزترە لە گوتەی راوی- گێراوە(لەو کەسەوە).،بۆ نمونە هشام لە حەدیسی بوخاریدا دەڵێت:لە باوکەمەوە و ناڵێت گوێم لێبوو یاخود پێی گوتم.،ئەوەش گومان دروست دەکات لە سەنەدی حەدیسەکە.،و خاڵێکی لەوە گرنگتر ئەوەیە کەوا ئیمامی مالیك فەرموویەتی:-حەدیسی هیشام لە عیراقدا وەرناگیرێت.

دکتۆر دلاوەر دەڵێت(گەر ئەوە بەوردی سەیری ئەو حەدیسەی کە بوخاری دەریهێناوە بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە — حەدیسەکە بەدواداچوونی بۆ کراوە، لە میانەی بەدواداچوونەکەدا بۆمان دەردەکەوێت هەموو راوی —گێراوەکانی ئەم حەدیسە هیچ کامیان خەڵکی مەدینە نین ،بەڵکو هەموویان عیراقین،ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە هیشامی کوری عەروە لە عیراقدا ریوایەتی کردووە لەدوای ئەوەی حیفز و ئەزبەری خراپ بووبوو.،ئیدی مەعقول نیە کەوا هشام ماوەێکی زۆر لە مەدینەدا بێنێتەوە و هیچ حەدیسێکی لەو شێوەیە ریوایەت نەکات و نەیگێڕێتەوە،بۆیە ئێمە لە کتێوی **موطا** ی ئیمامی مالیك هیچ حەدیسێك لەبارەی تەمەنی حەزرەتی عائیشە لە کاتی هاوسەرگیری لەگەڵ پەیامبەردا(ﷺ) نابینین لەگەڵ ئەوەی کەوا ئیمامی مالیك هیشامی کوی عەروەی بەراستەوخۆ لە مەدینەدا بینیوە و گوێی لێ گرتووە،ئەم دوو دەردە بەسن بۆ ئەوەی گومانمان دەربارەی ئەو ریوایەتی پێشتر زێدەتر بێت،بەڵکو لەسەر ئەم دەلیلەش شتێکی ترمان هەیە هەندێك ریوایەتی دروست و راست هەیە لە غەیری صەحیحی

---

[٥٩] فتح الباري شرح صحيح البخاري: ٤٤٨/١.

بوخاری هیشامی لەنێودا نیە و باس لەتەمەنەکەش ناکات..،کەواتە ئەو ریوایەتانەی صەحیحن باسی تەمەنی لەنێودا نیە[٦٠]..

ئەمانەی خوارەوە کۆمەڵە حەدیسگەلێکی صەحیحن لەبارەی هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو عائیشەدا -ڕەزای خوای لێبێت- کە لەرێگای هیشامەوە نەگێردراونەتەوە..

١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: " تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَوَّالٍ، وَأُدْخِلْتُ عَلَيْهِ فِي شَوَّالٍ، فَأَيُّ نِسَائِهِ كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي؟ فَكَانَتْ تَسْتَحِبُّ أَنْ تُدْخِلَ نِسَاءَهَا فِي شَوَّالٍ "[٦١]

٢- أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَوَّالٍ، وَأُدْخِلْتُ عَلَيْهِ فِي شَوَّالٍ، فَأَيُّ نِسَائِهِ كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي؟ قَالَتْ: «وَكَانَتْ تَسْتَحِبُّ أَنْ تُدْخِلَ عَلَى النِّسَاءِ فِي شَوَّالٍ»[٦٢]

٣-حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ

---

[٦٠] شبهات معاصرة حول الاسلام: ص٣٨.

[٦١] ينظر: مسند أحمد، حديث(٢٤٢٧٢)، باب: مسند الصديقة عائشة بنت الصديق ابو بكر: ٣١٩/٤٠.،

[٦٢] ينظر: سنن الدارمي، حديث(٢٢٥٧)، باب: بناء الرجل باهله في شوال: ١٤١٨/٣.

عَائِشَةَ قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَوَّالٍ، وَبَنَى بِي فِي شَوَّالٍ.[٦٣]

٤- أَخْبَرَنَا إِسْحَقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: أَنْبَأَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: «تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَوَّالٍ، وَأُدْخِلْتُ عَلَيْهِ فِي شَوَّالٍ، فَأَيُّ نِسَائِهِ كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي؟»[٦٤] صححه الألباني.

٥- أَخْبَرَنَا أَبُو عَبْدِ اللهِ الْحَافِظُ، وَأَبُو بَكْرٍ أَحْمَدُ بْنُ الْحَسَنِ الْقَاضِي قَالَا: نا أَبُو الْعَبَّاسِ مُحَمَّدُ بْنُ يَعْقُوبَ نا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِسْحَاقَ الْقَاضِي، نا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، انا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: " تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَوَّالٍ ، وَأُدْخِلْتُ عَلَيْهِ فِي شَوَّالٍ فَأَيُّ النِّسَاءِ كَانَتْ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي؟ وَكَانَتْ تَسْتَحِبُّ أَنْ تُدْخِلَ نِسَاءَهَا فِي شَوَّالٍ "[٦٥]

٦- حدثنا ابو بكر بن ابي شيبة قال: حدثنا وكيع بن الجراح، ح وحدثنا ابو بشر بكر بن خلف قال: حدثنا يحيى بن سعيد، جميعا عن سفيان، عن إسماعيل بن امية، عن عبد الله بن عروة، عن عروة، عن عائشة، قالت: «تزوجني النبي صلى الله عليه وسلم في شوال، وبنى

---

[٦٣] هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ.
ينظر: سنن الترمذي، حديث(١٠٩٣)، باب: ما جاء في الأوقات التي يستحب فيها الزواج: ٣٩٢/٢.

[٦٤] ينظر: المجتبى من السنن – السنن الصغرى للنسائي– المذيل بأحكام الألباني، حديث(٣٣٧٧)، باب: البناء في شوال: ١٣٠/٦. صححه الألباني.

[٦٥] أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ فِي الصَّحِيحِ مِنْ حَدِيثِ وَكِيعٍ عَنْ سُفْيَانَ.
ينظر: السنن الكبرى، حديث(١٤٧٠١)، باب: التزويج والبناء بالمرأة في شوال: ٤٧٤/٧.

**بي في شوال، فأي نسائه كان احظى عنده مني»[٦٦] ، وكانت عائشة تستحب أن تدخل نساءها في شوال.**

**واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين، وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله واصحابه اجمعين .**

الحمدالله..تەواو بوو..

یاد نورسی

[٦٦] **ينظر: سنن ابن ماجه، حديث(١٩٩٠)، باب: متى يستحب البناء بالنساء: ٦٤١/١..**

# پێرستی سەرچاوەکان

*قورئانی پیرۆز لەسەرەتا و کۆتایدا، لەپاشان سەرچاوەکان بەگوێرەی پیتی ئەبجەدی



| ژ | سەرچاوەکان |
|---|---|
| ١ | الإصابة في تمييز الصحابة، أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني (المتوفى: ٨٥٢هـ)، دار الكتب العلمية – بيروت – ط١(١٤١٥ ه)، عادل أحمد عبد الموجود وعلى محمد معوض. |
| ٢ | أنوار التنزيل وأسرار التأويل، ناصر الدين أبو سعيد عبد الله بن عمر بن محمد الشيرازي البيضاوي (المتوفى: ٦٨٥هـ)، دار إحياء التراث العربي – بيروت، ط١( ١٤١٨ هـ)، تحقيق: محمد عبد الرحمن المرعشلي. |
| ٣ | البداية والنهاية، أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي (المتوفى: ٧٧٤هـ)، دار إحياء التراث العربي، ط١ (١٤٠٨هـ – ١٩٨٨ م)، تحقيق: علي شيري. |
| ٤ | تاريخ الأمم والممالبك، محمد بن جرير بن يزيد بن كثير بن غالب الآملي، أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ)، دار الفكر – بيروت– |
| ٥ | تثبيت دلائل النبوة، القاضي عبد الجبار بن أحمد بن عبد الجبار الهمذاني الأسد أبادي، أبو الحسين المعتزلي (المتوفى: ٤١٥هـ)، دار المصطفى – شبرا– القاهرة. |

| | |
|---|---|
| ٦ | التربية الاسلامية، عدد ٣، السنة (٥٣). |
| ٧ | تفسير القرآن العظيم، (ابن كثير)، أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي (المتوفى: ٧٧٤هـ)، دار الكتب العلمية، منشورات محمد علي بيضون – بيروت، ط١( ١٤١٩ هـ)، تحقيق: محمد حسين شمس الدين. |
| ٨ | تقريب التهذيب، ابو الفضل احمد بن علي بن محمد بن احمد بن حجر العسقلاني (المتوفى:٨٥٢هـ)، دار الرشيد – دمشق– ط١(١٤٠٦هـ – ١٩٨٦م). |
| ٩ | الدر المنثور، عبد الرحمن بن أبي بكر، جلال الدين السيوطي (المتوفى: ٩١١هـ)، دار الفكر – بيروت. |
| ١٠ | الجامع لأحكام القرآن ( تفسير القرطبي)، أبو عبد الله محمد بن احمد بن أبي بكر بن فرح الأنصاري الخزرجي شمس الدين القرطبي (المتوفى: ٦٧١هـ)، دار الكتب المصرية – القاهرة–، ط٢(١٣٨٤هـ – ١٩٦٤) م، تحقيق: أحمد البردوني وإبراهيم أطفيش. |
| ١١ | حدائق الأنوار ومطالع الأسرار في سيرة النبي المختار، محمد بن عمر بن مبارك الحميري الحضرمي الشافعي، الشهير بـ «بَحْرَق» (المتوفى: ٩٣٠هـ)، دار المنهاج – جدة، ط١( ١٤١٩ هـ)، تحقيق: محمد غسان نصوح عزقول. |
| ١٢ | حياة محمد ورسالته، محمد علي اللاهوري، ترجمه إلى العربية: منير بعلبكي (ت ١٤٢٠ هـ)، دار العلم للملايين – بيروت– |

| | |
|---|---|
| | ط٢( ١٣٩٠ هـ). |
| ١٣ | دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، ابو نعيم أحمد بن عبد الله بن أحمد بن إسحاق بن موسى بن مهران الأصبهاني (المتوفى: ٤٣٠هـ)، دار النفائس، بيروت، ط٢(١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦ م)، تحقيق: الدكتور محمد رواس قلعه جي، عبد البر عباس. |
| ١٤ | دلائل النبوة ومعرفة أحوال صاحب الشريعة، أحمد بن الحسين بن علي بن موسى الخُسْرَوْجِردي الخراساني، أبو بكر البيهقي (المتوفى: ٤٥٨هـ)، دار الكتب العلمية - بيروت- ط١ (١٤٠٥ هـ). |
| ١٥ | الروض الأنف في شرح السيرة النبوية لابن هشام، أبو القاسم عبد الرحمن بن عبد الله بن أحمد السهيلي (المتوفى: ٥٨١هـ)، تحقيق: عمر عبد السلام السلامي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ط١( ١٤٢١هـ- ٢٠٠٠م). |
| ١٦ | سنن ابن ماجه، ابن ماجة أبو عبد الله محمد بن يزيد القزويني، وماجة اسم أبيه يزيد (المتوفى: ٢٧٣هـ)، دار إحياء الكتب العربية - فيصل عيسى البابي الحلبي، محمد فؤاد عبد الباقي. |
| ١٧ | سنن الترمذي، محمد بن عيسى بن سَوْرة بن موسى بن الضحاك، الترمذي، أبو عيسى (المتوفى: ٢٧٩هـ)، دار الغرب الإسلامي - بيروت، (١٩٩٨ م)، تحقيق: بشار عواد معروف. |
| ١٨ | سنن الدار قطني، أبو الحسن علي بن عمر بن أحمد بن مهدي بن مسعود بن النعمان بن دينار البغدادي الدارقطني (المتوفى: ٣٨٥هـ)، ط١( ١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٤ م)، مؤسسة الرسالة، بيروت - |

| | |
|---|---|
| | لبنان، تحقيق وتعليق: شعيب الارنؤوط، حسن عبد المنعم شلبي، عبد اللطيف حرز الله، أحمد برهوم. |
| ١٩ | السنن الكبرى، أحمد بن الحسين بن علي بن موسى الخُسْرَوْجِردي الخراساني، أبو بكر البيهقي (المتوفى: ٤٥٨هـ)، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان، ط٣(١٤٢٤ هـ – ٢٠٠٣ م)، تحقيق: محمد عبد القادر عطا. |
| ٢٠ | سير أعلام النبلاء، شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أحمد بن عثمان بن قَايْماز الذهبي (المتوفى: ٧٤٨هـ)، دار الحديث- القاهرة، (١٤٢٧هـ-٢٠٠٦م). |
| ٢١ | السيرة النبوية والدعوة في العهد المدني، أحمد أحمد غلوش، مؤسسة الرسالة للطباعة والنشر والتوزيع، ط١ (١٤٢٤هـ- ٢٠٠٤م). |
| ٢٢ | السِّيرةُ النّبوية – عرضُ وقائع وَتحليل أحدَاث، عَلي محمد محمد الصَّلاَّبي، دار المعرفة للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت – لبنان- ط٧( ١٤٢٩ هـ – ٢٠٠٨ م). |
| ٢٣ | السيرة النبوية على ضوء القرآن والسنة، محمد بن محمد بن سويلم أبو شُهبة (المتوفى: ١٤٠٣هـ)، دار القلم – دمشق- ط٢(١٤٢٧ هـ). |
| ٢٤ | شبهات معاصرة حول الاسلام، د. دلاور محمد صابر، دار المعرفة- بيروت – ط١(١٤٣١هـ- ٢٠١٠). |
| ٢٥ | شرح الزرقاني على موطأ الإمام مالك، محمد بن عبد الباقي بن يوسف الزرقاني (المتوفى: ١١٢٢هـ)، دار الكتب العلمية –بيروت- |

| | |
|---|---|
| | (١٤١١هـ). |
| ٢٦ | شرح علل الترمذي، أبو الفرج عبد الرحمن بن أحمد البغدادي المعروف (بابن رجب الحنبلي). |
| ٢٧ | صحيح البخاري، محمد بن اسماعيل أبو عبد الله البخاري الجعفي، دار ابن كثير ( اليمامة – بيروت)، ط١(١٤٠٧هـ-١٩٨٧م). |
| ٢٨ | صحيح مسلم، أبو الحسين مسلم بن الحجاج القشيري النيسابوري، دار الجيل، دار الآفاق الجديدة- بيروت- |
| ٢٩ | الصديقة بنت الصديق، عباس محمود العقاد، ط٥ (١٩٦٣م) – دار المعارف- . |
| ٣٠ | صفة الصفوة، ابن الجوزي (المتوفى:٥٩٧هـ)، دار المعرفة – بيروت- ط٥(٢٠٠٥م). |
| ٣١ | العلل ومعرفة الرجال، أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني (المتوفى: ٢٤١هـ)، دار الخاني – الرياض، ط٢(١٤٢٢ هـ – ٢٠٠١ م)، وصي الله بن محمد عباس. |
| ٣٢ | علم النفس، عبد علي الجسماني، سنة الطبع (١٩٨٤)م. |
| ٣٣ | فتح الباري شرح صحيح البخاري، احمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني، دار المعرفة – بيروت- (١٣٧٩هـ). |
| ٣٤ | القول المبين في سيرة سيد المرسلين، محمد الطيب النجار (المتوفى: ١٤١١هـ)، دار الندوة الجديدة بيروت – لبنان. |
| ٣٥ | الكتاب المصنف في الأحاديث والآثار، أبو بكر بن أبي شيبة، عبد الله بن محمد بن إبراهيم بن عثمان بن خواستي العبسي (المتوفى: ٢٣٥هـ)، مكتبة الرشد – الرياض- ط١ (١٤٠٩)، |

| | |
|---|---|
| | تحقيق: كمال يوسف الحوت. |
| ٣٦ | لاوس موسوعة الآباء والأمهات، جاك شميتز (أخصائي في طب الأطفال)، أعد النص العربي الدكتور يوسف فرحان، سنة الطبع (١٩٩٩م). |
| ٣٧ | المجتبى من السنن - السنن الصغرى للنسائي، أبو عبد الرحمن أحمد بن شعيب بن علي الخراساني، النسائي (المتوفى: ٣٠٣هـ)، مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب- ط٢(١٤٠٦هـ – ١٩٨٦م)، عبد الفتاح أبو غدة. |
| ٣٨ | مرويات غزوة بني المصطلق وهي غزوة المريسيع، إبراهيم بن إبراهيم قريبي، عمادة البحث العلمي بالجامعة الإسلامية، المدينة المنورة، المملكة العربية السعودية. |
| ٣٩ | المستدرك على الصحيحين، أبو عبد الله الحاكم محمد بن عبد الله بن محمد بن حمدويه بن نُعيم بن الحكم الضبي الطهماني النيسابوري المعروف بابن البيع (المتوفى: ٤٠٥هـ)، دار الكتب العلمية – بيروت- ط١(١٤١١ – ١٩٩٠)، مصطفى عبد القادر عطا. |
| ٤٠ | مستعذب الإخبار بأطيب الأخبار، أب مدين بن أحمد بن محمد بن عبد القادر بن علي الفاسي ( المتوفى: بعد ١١٣٢هـ)، دار الكتب العلمية – بيروت- ط١(١٤٢٥هـ-٢٠٠٤م) |
| ٤١ | المعجم الكبير، سليمان بن احمد بن ايوب ابو القاسم الطبراني، مكتبة العلوم والحكم – الموصل- (١٤٠٤هـ- ١٩٨٣م)، تحقيق: عبد المجيد السلفي. |

| | |
|---|---|
| ٤٢ | مسند الإمام احمد بن حنبل، أحمد بن حنبل، مؤسسة الرسالة، ط٢(١٤٢٠هـ- ١٩٩٩م)، تحقيق: شعيب الأرنؤوط. |
| ٤٣ | مسند الدارمي المعروف بـ (سنن الدارمي)، أبو محمد عبد الله بن عبد الرحمن بن الفضل بن بَهرام بن عبد الصمد الدارمي، التميمي السمرقندي (المتوفى: ٢٥٥هـ)، دار المغني للنشر والتوزيع، المملكة العربية السعودية، ط١( ١٤١٢ هـ - ٢٠٠٠ م)، تحقيق: حسين سليم أسد الداراني. |
| ٤٤ | المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم، مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري (المتوفى: ٢٦١هـ)، دار إحياء التراث العربي - بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي. |
| ٤٥ | نور اليقين في سيرة سيد المرسلين، محمد بن عفيفي الباجوري، المعروف بالشيخ الخضري (المتوفى: ١٣٤٥هـ)، ط٢( ١٤٢٥ هـ)، دار الفيحاء - دمشق. |

# پێرستی بابەتەکان



خوینەری زێدە ڕێزدار

ئەم کتێبە پوچەڵکردنەوە و ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو گومانانەیە کەلەبارەی هاوسەرگیری پەیامبەری خودا(ﷺ)دروســـــت کراون

- بۆچـــــی پەیامبـــــەر(ﷺ)هاوســـــەرگیری زۆری ئەنجـــامداون.؟
- بۆچی پەیامبەر(ﷺ) زیاد لە 4 خیزانی هەبووە لەیەک کاتـــــدا.؟
- ئایە تەمەنی حەزرەتی عائیشە(رضي الله عنها)لەکاتی هاوســەرگیری لەگەڵ پەیامبەر(ﷺ) 9 ســــالان بووە.؟

بۆوەڵامـــی ئەو پرســـیارانە و پرسیار کەلەلیکی دیـــکـــــە خوینەری بەڕیز فەرموون ئەم کتێبەی ژیر دەستان بخـــوێنەوە




چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر